

# واریقاتی ژیان

عەزیز مەلای ڕەش

بەرگی یەکەم

واریقات= سەربردە، بەسەرهات

# واریقاتی ژیان

بەرگی یەکەم

واریقات، سەربردە، بەسەرهات

عەزیز مەلای ڕەش

هەولێر
٢٠١٦

## واریقات

واریقات: کۆمەڵە ڕووداوو سەبردەیەکی زۆر بە نرخی میللەتەو سەرتاسەری قسەی نەستەقەو خۆش‌و خەمڕەوێنی وانەسەربەهەشانیش دەخاتە دنیای خەنین‌و حریتەوە.

زۆربەی هەرەزۆریان فۆلکلۆرن‌و هەندێکیشیان ڕووداوی ڕاستەقینەنە.



حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی راگەیاندن و
چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێر

هەولێر- گەڕەکی راستی/ نزیك گەراجی بەغدا
ژمارەی تەلەفۆن: ٠٦٦٢٢٥٨٥٤٢٧

سەرپەرشتیاری گشتی
سیروان عثمان

ناوی کتێب: واریقاتی ژیان
نووسین و کۆکردنەوەی: عەزیزی مەلای ڕەش
بابەت: واریقات، سەربردە، بەسەرهات
پیتچن: دیلان
هەڵەچنی: نووسەر
نەخشەسازی ناوەڕۆك و بەرگ: پەیام ئەحمەد
تیراژ: ٥٠٠ دانە
چاپ: چاپی یەکەم - چاپخانەی رۆشنبیری- هەولێر/ ٢٠١٦
نرخ: ٣٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارەی سپاردن (١٣٤)ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێدراوە

**لەسەرایيدا...**

باوكو كوڕێك سواری گوێدرێژێك بووبوون بەڕێگادا دەڕۆیشتن، ئەوقای چەند كەسی ڕێبوار بوونو گوتیان:

—چەند بێویژدانن ئەو دوو مل نەستوورانە سواری ئەو كەرە بەستەزمانە بوونە.

دووەم: باوكە بە كوڕەكەی گووت:

—ڕۆڵە با هەردووكمان دابەزین.

كەسانی دیان تووشبوونو گوتیان:

—بەخوا نەوانە بێ ئەقڵن هەردووكیان بە پێیان دەڕۆنو كەچی كەرەكەشیان بە بەتاڵی دەڕوات.

سێیەم: باوكە سواربوو.. و كوڕە بە پێیان.

ئەوجارە پێیانگوترا:

—بڕۆنیێ: ئەو باوكە مل ئەستوورە بێویژدانەی بەخۆی سواری بووەو كوڕەكەشی بەپێیان دەڕوات.

چوارەم: ئەو جارە كوڕە سوار بوو.. و باوك بەپێیان.

تووشی كەسانی تربوونو گوتیان:

—بڕۆنیێ بڕۆنیێ ئەو یەختیارە فەقیرە بە پێیاندەڕوات كەچی كوڕە مل ئەستوورەكەی سواربووە.

......................................................

سورِ دەزانم: ئەو واریقاتانەش دەچنە ژێر ئەو قاوخەوە.

لە دلّم والاّیە هێندێك لە خوێنەران تفـو نەفرەتی دەکەن.

هێندێك پێ کەیف خۆشدەبن‌و باسی تر ناکەن.

هێندێکیش لە ناخەوە دەمنگێنن‌و دەڵێن:

—توخوا نووسین لە دنیادا قات بوو تەنیا ئەو قسە جرِناو فرِنـاو قـۆرِو دزێوانە، نەبن.

کەچی لە راستیدا پاشـە رۆژ هـەرمن سـەرکەوتوودەبم. ئەمـەش بـۆ ئەمرۆ.. دەدرکێنم:

یەکەم- کە دەزانن عەلەق‌و بەلەق‌و دزێون مەیانخوێننەوە.

دووەم- من هەلّم نەبەستاون، بەرهەمی میللەتەکەتانـەو عـەیب لـە ئەوان بگرن‌و بلّێن: ((بۆ ئەو قسە لاترِقەوچانەتان بەسەر زاردا هـاتووە)).
کە سێکیش ..............

سێیەم- هەتا رۆژی قالوو بەلاێی من شانازیان پێوە دەکەم.

کەتوانیم پاش هیلاکی و شەکەتێکی یەکجار زۆرەوە لە مردنیان دەرباز بکەم.

**داوا:**

داوا لەسەرجەم نووسەرو خوێنەدوارانی هێژاو ئازیز دەکەم، هەر.. واریقاتو سەربردەیەکی سەیرو سەمەرەیان لایە، یان خۆیان دروستی دەکەن، باجوێنی زۆر دزێو.و قۆڕیش بێت، بەوناونیشانەی خوارەوە بۆم بنێرن.

منیش خوای مەزن یاربێت، لەبەرگی دووەم بەشانازیو سوپاسەوە بۆیان بڵاو دەکەمەوە.

بەس دەبی ناونیشانی خۆیان لەگەڵ دا بێت.

یەکەم:- شاری هەولێر: یەك لە کتێب فرۆشەکانی تەك قەڵات.

دووەم:- موبایل- ٠٧٥٠٧٧٩٠٦٩١

..................................................

**تێبینی:-**

١- چەند واریقات= ((سەربردە))ی کۆنم بەدەست کەوتنو ناچاریان کردم سەربە کتێبە نایابو پیرۆزەکەی مامۆستای ئازیزم پایە بەرزو خوالێخۆشبوو: ((عەلائەدین سەجادی)) دابگرم. ئەوانەی لەودابوون دەلحاز جیڕبەجیڕم کردن. کەچی تاكو تەرایان دڵم لێیان ئاو ناخواتەوەو زۆریش لە ((ڕشتەی مرواری)) گەڕام نەکەوتنە بەرچاوم. بۆیە گریان بەرەواژی دەرچوو داوا لەگیانی پاکی مامۆستای تایەن دەکەم بەدزم لەقەڵەم نەدات.

٢- هەندێك لە واریقاتەکان لە کتێبی ((خورجەیەك لە فولکلۆری دەشتی هەولێر))دا بڵاوکراونەتەوە. لێرەش بۆ مەبەستێکی تایبەت دووبارە بڵاوکراینەوە.

## پیتی ـ أ ـ

**١- ئاخـ ...خ بۆ کێری:**

فەقێیەك لەکاتی خوێندنی کتێبی ((شەرحەمو غنی))، لە ناو فەقێیان لە توغیانی گەنجاتی دا دەبێتو گرو خورشتی گەڵو گوانی بیستو چوار سەعات ئارامی لێهەڵگرتبوو. دوای تەواوکردنی خوێندن ژنی هێنا. کەچی ئەو گڕو سۆزەی پێشتری نەمابوو .. و هەرجارێ کەلەگەڵ مەلا ژن جووت دەبوو .. و دەیگوت:

— ئاخـ ...خ بۆ کێری شەرحەموغنیم.

**٢-ئاشەوانانێ:**

ئەو کەسەی دەبووە ئاشەوان، بۆ ئەوەی ورگن دیاربێت بالیفێکی لەسەر زگی خۆی لەژێر کراسیدا دەناو لەسەر گازەرەی پشت دەخەوت. کوڕێکی مێردمنداڵی هەیەو لە جیاتی لە دیارئاشەکە، کە دووسێ تەنەکە لەسەر یەکتر دادەندران. دانیشتو باوکیشی پرخە پرخی لەدوورەوە دەبیسترا. یەکێك چووە لای کوڕەکەو گوتی:

— من باراشهێرم و هاتوومە باراشم بۆ لێ بکەن.

کوڕەکە ئەوسا، بەداران وەرگەڕا زگی باوکی‌و هەرجاریّ لێیدەداو دەیگوت:

—بابە، بابە.

تا باوکی بەخەبەر هێناو :

—هەستە باراش هاتووە.

ئاشەوان ڕووی لە باڕاشهێڕ کردو گوتی:

—باراشەکەت چییەو لەچیت بارکردووە؟.

باراشهێڕ گوتی:

—بارەکەم نیسکە، وڵاخەکەم گیسکە.

ئاشەوان ڕووی گرژ کردو گوتی:

—ئاشەکەم بەردەکانی کول بوونەو بیرازیان دەوێت ئەمڕۆ پێمناکرێت.

باراشهێڕێکی تر هات‌و گوتی:

—باراشەکەم مزاشەو وڵاخەکەم جاشە.

ئەویشی ڕەوان کردەوە.

یەکێکی تر هات‌و گوتی:—

—کەرم پێیەو باراشەکەم جۆیە.

ئاشەوان بەهەشتاوییەوە گوتی:

—ماکەرە، یان نێرەکەرە؟.

—نێرە کەرە.

ئەویشی بەنائومێدی ڕەوان کردەوە.

دواجار باراشهێڕێك هات‌و گوتی:

— بارەکەم گەنمەو کەرەکەشم ماکەرە.

ئاشەوان یەکسەر قیت بووەوەو باراشەکەی بە گوراح خۆشییەوە، لەگەڵ هێنانە خوارەوەو کوڕەکەو باراشهێڕەکەی بە باراش لێکردن خەریك کردن‌و بەخۆشی چووە گژ ماکەرەکە.((بریتی بوو لە پیاوێك)).

هەر کە باراشهێڕەکە دێتە دەرەوەو دەیبینێت‌و دەڵێت:

— کوڕە ئەوە چ دەکەیت!؟.

ئاشەوان یەکسەر.. ڕووەو قیبلە لەسەر چۆك دادەنیشێت‌و دەڵێت:

— التحياتُ والمباركاتُ........................

### ٣- ئاغا.... تۆ:

ئاغایەك ڕۆژێك لەگەڵ خوبزەیەکی خۆی لەنێو ئاوایی دەگەڕان. گەیشتنە ماڵی خوبزەکەو ئاغا هەرکە خێزانەکەی دەبینێت پێیدەڵێت:

— ژنەکەت چ نییە.

ئەویش یەکسەر بەڕووی دەتەقتەوەو دەڵێت:

— ئاغا تۆ نەتگایە. گانی چەندی بلێیت خۆشە.

### ٤-ئاگرێکی چاکت کردەوە:

ژن‌و مێردێك، بەیەکەوە لە دەورەی قووناگردان دانیشتبوون.

ژنە ویستی ئاگر لە ئاگردان بکاتەوە، لەگەڵ خۆ خواردنەوە و پف لێکردندا دەنگێکی گەورەی لێوەدێت.

پیاوەکە بە پێکەنینەوە دەڵێت:

— بە ڕاستی ئاگرێکی چاکت کردەوە.

**٥- ئاو هاتنەوە:**

لەسەرەتای پەنجاکانی سەدەی رابردوودا کوڕێکی گوندی ((لاوەر))ی نکار چیای ((قەرەچوغ)) تۆزێك گێل دەبێت. ناوی عەسکەری دێت. لەقەزای ((مەخموور))، بۆ ئەوەی ((فەحس))بکرێت تا بزاندرێت بەکەڵك سەربازی بە زۆر دێت، یان نایەت بانگ دەکرێت.

ئەوکات دختۆر دەستی بەعەورەتی ئەو کەسەدا دەهێنا کە دەکرایە عەسکەر.

هەر کە دختۆری مەخموور دەست بە عەورەتی ناوبراو دادەهێنێت، لەبەر لووسی پەنجەکانی کوڕە.. ناولەپی دختۆری پڕ ئاودەکات.

ئەویش یەکسەر بە بێزکردنەوەی ((ئیێح..)) بە ئاوەوە زرچەی لە بناگوێی کوڕە دەهێنێت.

**٦- ئەتوو هەتا ئێستا:**

شەوێك پیاوێك داوای جووت بوون لە ژنەکەی خۆی دەکات.

ئەویش عوزری دەبێت و ڕێنادات.

پیاوەکە دەڵێت:

— ئەگەر نەمدەیتێ دەچمە گژ ماکەرەکە.

— کەیفی خۆتە.

لەکاتی کردنیدا کەرەکە تڕێکی لێبەر دەبێت.

ژنە دەست بەگریان دەکات.

پیاوەکە پێیدەڵێت:

— ئەوە بۆ دەگریەیت؟.

ئەویش بەگریانەوە دەڵێت:

—تۆ هەتا ئێستا ئەوهات نەگایمە ترِم پیِ بکەیت.

**٧- ئەحمەد چەلەبی:**

ڕێزدار ئەحمەد چەلەبی بارەگای لە خانووی ((ئەحمەد شێخۆ))ی گەڕەکی ڕوناکی بوو. کە ئێستا بارەگای ((یەکێتی نیشتمانی))یە. گەڕەکەکەیان لە زەواق نابوو. چابوو زوو باریان کرد.

ڕۆژێك دوای چۆڵ بوونی بارەگاکە، من دیتم: سەگێك لەبەر دەرگای حەوشەی خانووەکە هەڵتوتکاوە. گەیشتمە دوکانی دۆستی دڵسۆزم خوالێخۆشبوو مامۆستا ((عارف شەریف)) چەند کەس دانیشتبوون و گوتم:

—ئەحمەد چەلەبی ماڵەکەی بارکردووەو بەخۆشی نەڕۆیشتووە .

ئەوانیش گوتیان:

—بەخۆشی ڕۆیشتووە.

گوتم:

—ئەدی ئەوەنییە لەبەر دەرگەی حەوشە دانیشتووە.

هەر کە سەیریان کرد لێکرِا لە حریتەیاندا.

**٨- ئەدی ئەمن**

سێ ژن سواری تەکسیەك دەبن و لە شۆفێرەکە دەپرسن:

—ناوت چییە؟.

—مام سابیر.

—خێزانەکەت ناوی چییە؟.

— خەجێ.

— منداڵت هەیە؟.

— بەڵێ کوڕێك و کچێکم هەیە.

— کوڕەکەت ناوی چییە؟.

— ئاسۆ.

— کچەکەت؟.

— ئاسیا.

— کوڕەکەت ژنی هێناوە؟.

— بەڵێ دوو منداڵی هەیە.

— ئەی کیژەکەت؟.

— منداڵێکی هەیە.

زۆرنابات ئاسایش دەیانگرن و ڕوو لەمام سابیر دەکەن و:

— تۆ ئەو قەحبانەت بۆ کێندەر دەبردن؟.

بە واق وڕمانەوە دەڵێت:

— قاحپەی چی.. نەفەر بوون هەڵم گرتبوون.

— ڕاست ناکەیت.

— دەتوانن تەحقیق بکەن.

یەك لە ژنەکان بانگ دەکەن و پێیدەڵێن:

— ئەو پیاوە دەناسیت؟.

یەکسەر دەڵێت:

— بەڵێ ئەوە مام سابیری گەواد باشی خۆمانە.

مام سابیر هاروهاج دەبێت‌و ڕووی کوندەی دوو بۆنگی ئاسا کەسکوون هەڵدەگەڕێت‌و بە هەڵچوونەوە دەڵێت:

— کچێ هەی بێنامووس ئەمن کەینێ ئەنگۆم ناسییە!.

ژنە بەشێوەیەکی ئاسایی یەوە دەڵێت:

— بۆ.. تووڕە دەبیت: ناوت مام سابیرەو ژنەکەت ناوی خەجێیەو ئاسۆی کوڕت دوو منداڵی هەیەو ئاسیای کچیشت منداڵێکی هەیە.

مام سابیر هیچ بەڵگەی پاکانەی نامێنێت‌و سەری بەخۆدا شۆڕ دەکاتەوە.

ژنی دووهەمیش بەهەمان شێوە.

ئاساییش ڕووی تێدەکەن‌و دەڵێن:

— ئەگەر سێیەمیش شایەتی ئاوا بدات ڕەوانەی مەحکەمەت دەکەین.

لە ژنی سێیەم دەپرسن:

— ئەو پیاوەی دەناسیت؟.

— بەڵێ. ئەوە ئەو مام سابیرەیە فەرەنسۆی کوشت.

ئەملا لەولا خراپتر. مام سابیر سەت خۆزگەی بە توومەتەکەی بەرایی دەخواست، بەوپەڕی هەڵچوونەوە دەڵێت:

— کچێ هەی بێنامووس ئەدی ئەمن مام سابیری گەواد باشی خۆتان نیمە!.

**٩- ئەز بەخۆ كۆكم:**

كوتاڵ=((قوماش)) فرۆشێك لەناو عەشیرەتی هەركی دەگەڕا كوتاڵ بفرۆشێت. تووشی ماڵێك هات ژنەكەی مەشكەی دەهەژاند. كراسی بەری لەچەند شوێن دا.. دڕابوو.. لەگەڵ هەر جووڵانێكی بەهەژاندنەكەوە جێیەكی بەدەر دەكەوت‌و دایدەپۆشتەوە.

قوماش فرۆشەكە دڵنیا بوو: ئەوە موشتەرییەو لێی چووە پێش‌و گوتی:

— دایە بەكەس نازانیت قوماش بكڕێت؟.

ئەویش یەكسەر بەم تەرحە وەڵامی داوەو:

— وەڵلا برا .. ئەز بەخۆ كۆكم و ناگاشی لە حێلی نییە.

**١٠- ئەستەغفیروڵلا:**

سەلیم ناوێك حەزی زۆر لە شیعرو ئەدەبیات دەبێت‌و گەلێك ڕێزی شاعیرانی دەگرت‌و خزمەتی دەكردن.برادەرێكی شاعیری میللی دەبێت لەدوای هەر شیعرێك ((ئەستەغفیروڵلا))یەك دەڵێت.

ڕۆژێك سەلیم دەعوەتی دەكات. ئێوارە شیوی ((دۆینە))ی بۆ لێدەنێت.

شاعیرەكە دەستی زۆر كورت دەبێت‌و دەیویست سەلیم یارمەتییەكی بدات. كەچی نەیارمەتیداو نەشیوەكەشی شیوی دەعوەت كردن بوو. بەڵام چاوو ڕووی نەبوو لەم ڕووەوە كەم‌و زۆر زار هەڵبێنێت.

سەلیم لەنیوە شەودا پێیدەڵێت:

— دەبێ شیعرێكمان بۆ بڵێیت:

ئەویش یەكسەر دەڵێت:

— دۆینەی لێنا بە قوڕولیم

هیچم نییە تا پێ بژیم

لەبابی بابت بەم سەلیم

ئەستەغفیروللا هیل عەزیم.

**١١- ئەگەر ئەوێ نەبینم:**

کابرایەك بەلای کۆڵکەرانی دەشت دا دەڕواتو بە ئەنقەست خۆی کوێر دەکات.

ژنە کۆڵکەرەکان هەر کە دەیبینن کابرا وا بەکوتە کوتی کۆپاڵەوە دەڕوات، یەکێکیان بۆ تەجروبە، بە ڕووتی دەچێتە پێشیو دەستی خۆی دەخاتە سەر نێوچەوانیو دەڵێت:

— ئێرە دەبینیت؟.

دەڵێت:

— نەخێر.

دەستی داوێتە سەر مەمکیو دەڵێت:

— ئەدی ئێرە؟

— نابینم.

دەست لەسەر ناوکی دادەنێتو دەڵێت:

— ئەدی ئێرە؟.

— نابینم.

لەدواجاردا دەست داوێتە سەر عەوردتیو دەڵێت:

— ئەدی ئێرە؟.

کابرا یەکسەر دەڵێت:

— ئەگەر ئەوێ نەبینم مانای وایە کوێری دنیاو قیامەتم.

**١٢-ئەگەر بەتەمای:**

ئافرەتێك خەناوکەیەکی زۆر جوانو قەشەنگی دەگمەنی سەردەمی لەمل دەبێت.

کچەکەی بەشانازییەوە پێیدەڵێت:

— دایە هەقە هەتا مردن مەمنوونی باوکم بیت، ئەو خەناوکە نایابەی بۆت کڕیوە.

ئەویش بە لچ خوارکردنی غەزەبەوە دەڵێت:

— وەللا ئەگەر بەتەمای باوکت دەبووم تۆشم نەدەبوو.

**١٣- ئەگەر تێت نەناوە:**

ئاغایەك لەشەوێکی چلەی زستانی کوێستانەکان بەفر دووسێ بستێ کەوتبوو، داوا لەژنەکەی دەکات لەگەڵی جووت بێت.

ژنەکەش دەڵێت:

— بەو ساردییە ناتوانم بچمە کانی خۆم بشۆم.

ئەویش دەڵێت:

— بەیانی بەخزمەتچییەکەمان وادەکەم ئاوت بۆ بێنێتە ماڵەوە.

ژنە سەلماندی.

خزمەتچییەکە کە گوێی لێدەبێت دەڵێت:

— ئاغا ئەگەر تێت نەناوە، بەتەمای من تێمەنێ. ئاوتان بۆ ناهێنم.

**١٤-ئەگەر دایكت:**

كوڕێكی گەنج لەكاتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشـی ((ئایـدز)) لـە دەرەوە گەڕاوەو ڕووی لە باوكی كردو گوتی:

—بابە خۆتۆ تووشی ئایدز نەبوویت؟.

—نەخێر.

—ئەدی دایكم؟.

—ئەویش تووش نەبووە.

—چۆن دەزانیت؟.

—ئەگەر دایكت تووش بوایە، پیاوانی گەڕەك بە بتوونی تووش دەبوون.

**١٥- ئەگەر سیحەتت تەواو بێت:**

دووسێ ژن بەیەكەوە باسی كێر دەكەن.

هەریەكەیان وەسفی دەعبای مێردەكەی خۆی دەكرد.

یەكێكیان چـەند مێـردی كردبـوو.. بـە زەردەخەنــەوە ڕووی تێكـردن و گوتی:

—ئەنگۆ دنیا نەدیتەنە، هەر هـی یـەك پیاوتـان دیـوە، كەچـی مـن تەجروبەم زۆرە. كێر هەیە گچكەیە . هەیە ناوەندییە. هەشە زۆر گەورەیە.

یەكێكیان بە مەراقەوە گوتی:

— گەورەكەیان وەكی هی كەرێ دەبێت.

ئەویش گوتی:

—ئێمە كو بەرگەی هی كەرێ دەگرین.

یەكێكی تر هەرزوو.. وەریگرتەوەو گوتی:

– ئەگەر سیحەتت باش بێت بۆ بەرگەی ناگرین.

**١٦-ئەگەر لەگەڵ دایکت بووایت:**

پیاوێك لەگەڵ کوڕێکی گچکەی دەچنە ((حەمام= گەرماو)). منداڵەکە لەسەر کاشی لووسی گەرماوەکە خلیسك دەبات‌و خۆی یەکسەر بە گونی باوکی دەگرتەوە.

باوکەکە ئەوسا دەڵێت:

– ئەگەر لەگەڵ دایکت بووایت پشتەسەرت بەعەردی دەکەوت.

**١٧- ئەگەر لۆ تامیَ بێت:**

پیاوێك چووە لای شفتی فرۆشێك شفتی بکڕێت.هێندێك لە شووتییەکان کونێکی ڕەشیان تێدا بوو.

کڕیارەکە پەنجە لە کونی (شامی)یەك ناو بۆ دەمی خۆی بىرد تماشای بکات.

شفتی فرۆش لەدڵی گران دەبێت‌و بۆ ئەوەی پێی بسەلمێنێت کارێکی دزێوە دەڵێت:

– تۆخوا ئەگەر من ئەوها لەتۆ بکەم تووڕەنابیت!.

ئەویش بەشێوەیەکی ئاسایی یەوە دەڵێت:

– ئەگەر بۆ تامیَ بێت ناو.

**١٨-ئەگەر ماکەر بووایت:**

ڕۆژانە دانی ئێواران چەند نووسەرێك دەچوونە دووکانی دۆستێکیان کاتیان بەسەر دەبرد.

ڕۆژێك نووسەرێكی دەشت لەگەڵ چوونە ژوورەوە شانی بە شانی نووسەرێكی شار دەكەوێت‌و یەكسەر پێیدەڵێت:

—بۆ دەست بۆ قوونم دەبەیت؟.

ئەویش دەڵێت:

—ببورە من خەڵكی دێهاتم فێرە قوون گان نەبوومە. بەڵام ئەگەر ماكەر بووایت یەك بستم نەجات نەدەدایت.

### ١٩- ئەمنت هەند:

پیاوێكی ناپووت‌و پووخەڵەو بێهێز لە ڕووی ((جنسیە))وە، نەیدەتوانی كامی دڵی خێزانی خۆی تەواو دامركێنێتەوە.كەچی هەر زاری دەكردەوە پێیدەگووت:

—دایكت بگێم.

ئافرەتەكەش جارێك بە ڕوویدا زیت دەبێتەوەو دەڵێت:

- ئەمنت هەند گایە ئەوجا نۆرەی دایكمە.

### ٢٠- ئەمن لەپێشەوە:

دوو ئافرەت یەكێكیان لە پێشەوەی ((ئامانە)) سوار دەبێت‌و ئەویتر لەدواوە.

ئەوەی پێشەوە پارە دەدات‌و بەدەنگی بەرزەوە دەڵێت:

—كچێ عەیشێ من لەپێشەوەم دایە تۆ لە پاشەوە نەدەیت.

### ٢١-ئەمن مامۆستا كەمە:

لە شەڕێكی نێوان سوپای عێراق‌و پێشمەرگاندا دوو سەربازی دیل دەگیرێن. یەكێكیان مامۆستا دەبێت‌سەر كردەی پێشمەرگەكان دەڵێت:

– بيانبەنە پەنايەك مامۆستاكەی بگێن و ئەوی تریش بكوژن.

هەر كە دەيان بەن مامۆستاكە هەرزوو دەڵێت:

– ئەمن مامۆستا كەمە.

**٢٢- أنا ما أعرف عربي:**

رۆژێك بەرپرسێكی عەرەب لەنێو شاری كەركووك بەخۆی و چەند پۆلیسەوە گوزەریان دەكرد. شورتەكان هەموویان عەرەب دەبن تەنیا یەكێكیان كورد دەبێت. لە شوێنێكدا تووشی نێرەكەرێك هاتن دەزەڕی و بەرپرسەكە ڕووی لە كوردەكە دەكات و دەڵێت:

– كاكە ئەوە چدەڵێت؟.

ئەویش یەكسەر دەڵێت:

– أنا ما أعرف عربي.

**٢٣-أنا موافيج:**

پیاوێكی ناوداری دەشتی هەولێر، لە زەمانی ((نووری سەعید))دا ((نائیب))دەبێت ((ناتوانم ناوی بهێنم)) ڕۆژێك كۆبوونەوەیەك دەكرێت ئەو خەوی لێدەكەوێت و قاعەكە چۆڵ دەبێت.

فەڕاش دەست بەماڵینی قاعەكە دەكات . نائیب بەهۆی خشەخشی گێسكەوە بەئاگا دێتەوەو یەكسەر لەگەڵ قیت بوونەوە دا دەست بەرز دەكاتەوەو دەڵێت:

- أنا موافيج.

### ٢٤-ئەو بایە فێنکە:

ڕێزدار مامۆستا ((مەلا عوسمان))ی مامۆستا ((مەلا ساڵح))ی خواڵێخۆشبوو زۆر قسە خۆش‌و نوکتە باز بووە.لە ئامادەیی کچان دەرسی دەگوتەوە.

ڕۆژێك قوتابییەکان لێکرا پێی پێدەکەنن دوای هەوڵ‌و تەقەلایەکی زۆر یەکێکیان دەڵێت:

—مامۆستا قۆپچەی پەنتلۆنەکەت بووەتەوە.

ئەویش بەبێ ئەوەی خۆی لە گوورەبباتە، بە پێکەنینەوە لەگەڵ داخستنەوەی دوگمەکەوە دەڵێت:

—دەمگوت: خوایە ئەو بایە فێنکە لە کێندەر دێت.

### ٢٥- ئەو بوختانە گەورەیە:

دەروێش کەریم بە دەروێش ((هەمین)) فێربوو بوو.. و ناوە ناوە لەجێی ژوواندا بە ئاکامی خۆیان دەگەیشتن . جارێك دەروێش کەریم لەکاتی تیوەژاندندا دەڵێت:

—نازانم ئەوعالەمە چۆن ئەو بوختانە گەورەیان هەڵبەستاوەو دەڵێن:- دەروێش کەریم بەدەروێش هەمین فێربووە!.

ئەویش بەپشوو سوارییەوە لێیوەرگرتەوەو:

—ئاخری زەمانە هەرچی بڵێیت ڕوودەدات.

### ٢٦- ئەوە تازە بزانم:

کابرایەکی گێلۆکە ئافرەتێك داخوازی دەکات و چەند ساڵ لای دەبێت. ڕۆژێك ژنەکە نەخۆش دەکەوێت‌و .. وەفات دەکات.

وەختێ تەرمەکەیان بەرەو گۆڕستان دەبرد مێردەکەی هێدی هێدی لەبەر خۆیەوە پێدەکەنێت.

لێیان پرسی:

— ئەوە بەچ پێدەکەنیت؟.

گوتی:

— لەوەتی من هێناومە ئەوە تازە بزانم بۆ کێندەر دەچێت. پێشتر هەموو ڕۆژێك لە سبیاتێوە هەتا ئێوارە دەڕۆیشت هەر کە لێمدەپرسی:

— لە کێندەر بوویت؟.

هەرجارێ دەیگوت:

— چوومە ماڵی بابم، برام، خوشکم، پلکم، مامم، برادەرم.

**٢٧- ئەوە حەمەدی برامە:**

کابرایەکی فەقیروگێلۆکە ژنی بۆ دەهێنن هەرچەند هەوڵ دەدات چی بۆ ناکرێت. ناچار دەچێت بە براکەی دەڵێت:

ئەویش لە جیاتی دەچێتە گژ بووك و زۆری پێناچێت ژنە هاواری لێهەڵدەستێت.

مێردەکەی لەودیو.. دیوارەوە دەڵێت:

— ئەوە من نیمە حەمەدی برامە ، حەمەدی برام. وەڵلا هەتا هورگت نەدڕێنێت یەخەت بەرنادات.

**٢٨- ئەو کەتنەی بەوکراوە:**

ئافرەتێك لەپەڕینەوەی ڕووبارێکدا کەس دیار نابێت و ئاوەڵکراسەکەی لەپێدەکاتەوە.

کابرایەکی قەشمەرباز ، لەپەناوە دەیبینێت و پێیدەڵێت:

— ئەریّ خوشکیّ چشتەکەت بۆ .. وا شێواوە؟.

ئەویش خۆی هەرگیز لە گوورە نابات و دەڵێت:

— ئەو کەتنەی بەوکراوە، بەدەمی تۆ بکرابووایە شتاقە ددانت نەدەما.

**٢٩-ئەوکچە:**

تازە زمانی کوردی لە قوتابخانەکانی شاری هەولێر دەخوێندرا.

ڕۆژێك لە قوتابخانەیەکی خانەی مامۆستایاندا مامۆستاکە لەسەر سەبوورە دەنووسێت:

— ئەو کچە قژی ڕەشە .

قوتابییەکی کیژ کوردی باش نەدەزانی و خوێندوویەوە:

— ئەو کچە قوزی ڕەشە.

**٣٠- ئەو لیرەش:**

کاتی خۆی جەندرمەی تورکی داگیرکەر دەیانویست زمانی کوردی لە کوردەکانی ژێر دەستیان قەدەغە بکەن.

خەڵکی دێهاتەکان هەر کە بەرهەمی ئاژەڵیان بۆ فرۆشتن دەبردە شار، جەندرمە کردبوویانە خوو.. لەدیاریان ڕادەوەستان. هەر وشەیەکیان بەکوردی بگوتبووایە لیرەیەکیان سزا لێدەستاندن.

کوردێکی جوتیار، ڕۆژێك چەند جامە ماستی لا دەبێت و تورکیشی نەدەزانی، پارەی ماستەکەی هەموو بەسزا لێدەسێنن. تەنیا لیرەیەکی لا دەمێنێت، ئەوسا لیرەکەی بۆ جەندرمەکان ڕادەگرێت و دەڵێت:

— با ئەولیرەش لەباتی بەکوردی دەڵێم: کێرم بەقوزی دایکتان.

**٣١- ئەوە هەر ئەو قوونو سمتەیە:**

ڕۆژێك كابرایەكی چاو پووشاوی و كز سواری پاسێكی زۆر قەرەباڵغ دەبێت. بە پێوە جێگەی دەرزی نەدەبووەوە. بە ڕێكەوت قوونی ژنێكی تۆزێك گۆشتن كەوتبووە ڕاست عەورەتیو ناوە ناوە لەگەڵ هەڵتەك هەڵتەكی پاسەكەدا قوونی ئافرەتەكە تەواو تەبقی عەورەتی دەبوو.

ئەویش بەئەنقەست زیاتر پاڵی پێدەداو لە ززەتی لێوەردەگرت. هەتا ئافرەتەكە دابەزیو ئەویش هەر زوو پاش ئەو دەچێتە خوارەوەو بەدوایەچوو. كاتێك ژنەكە پێچەكەی ڕووی لاداو گوتی:

— ئەوە هەر ئەو قوونو سمتەیە ڕۆژانە لێیوەڕسیت.

ئەوجا زانی خێزانیتی.

**٣٢- ئەوەی ئاوی خواردەوە:**

پیاوێكی خاوەن دوو ژن میوانی دێتو یەك ژووری نووستنی دەبێت.

میوانەكە شەو لە نزیك سەلاجە دەنوێت.

خانە خوێیەكە شەو داوا لە ژنە گچكەكەی دەكات لەگەڵی جووت ببێت.

ژنەش دەڵێت:

— میوانەكە بەخەبەرە.

— بڕۆ ئاو لەسەلاجەكە بخۆرەوە ئەگەر بەخەبەر بێت دەزاندرێت.

هەر كە میوانەكە هەستی نابێت ئیشی خۆیان دەكەن.

ژنە گەورەش ددەڵێت:

— مادام لەگەڵ هەوێكەمت كرد، دەبێ لەگەڵ منیش بكەیت.

ژنەگەورەش تەرحی ژنە گچکە ئاو لەسەلاجە دەخواتەوە.

بۆ سبەینێ میوان ڕوو لەخانەخوێ دەکاتو دەڵێت:

— ئەو شەو لەزگ بوو لە تێنان بخنکێم.

ئەویش دەڵێت:

— سەلاجەت لێ نزیك بوو.

— ترسام نەوێرام بچم.

— لەبەرچی..!؟.

— ئەوەی ناوی لەسەلاجە خواردەوە تۆ گات.

**٣٣-ئەوەی پێکیدەهێنایەوە:**

ژنو مێردێك بەشەڕهاتنو هەر پێك نەدەهاتنەوە. کوڕەکەیان ڕووی لە باوکی کردو گوتی:

— بابە ئەنگۆ کەپێشتر بەشەڕ دەهاتن زوو پێك دەهاتنەوە، کەچی ئەوا ماوەیەکە لەیەکتر توورەنەو پێکنایێنەوە.

بابە کە بەئاخ هەڵکێشانەوە گوتی:

— ڕۆڵە ئەوەی پێکیدەهێنایەوە مردووە.

**٣٤- ئەوەی خوا بە ئێمەی کردووە:**

لە ئاخرو ئۆخری حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا شەوێك کەندە گەورەکەی ناوەراستی گوندی ((چەغەمیرە))ی ناوچەی کەندیناوە یەکجار زۆردێتو خانووێکی زۆر دەڕووخێنێت. هەتا مزگەفتەکەشی لەبنو بۆتکەوەی هەڵتەکاندو زەرەرو زیانێکی زۆری بەخەڵکەکەی گەیاند.

هەر لەم ساڵەدا بەرپرس‌و نووسەری سەر ژمێر =((ئیحسا)) دەچنە گوندەکەو میوانی ماڵی مەلا دەبن و هەرکە لێیدە پرسن:

—زەرەرتان بەلافاوەکە زۆر بووە؟.

مەلا یەکسەر دەڵێت:

—ئەوەی خوا بە ئێمەی کردووە، حەرەس قەومیش نەیکردووە.

**٣٥-ئەوەی دانوو زۆر بخوات:**

لە گوندێك لە گوندەکانی دەشتی هەولێر چەند ماڵێك ساواریان دەکوڵاند. یەکێك هێندە دانووی خستە نێو دەمی‌و گوتی:

—دەڵێن ئەوەی دانوو زۆر بخوات کێری پیێ ئەستوور دەبێت.

کابرایەك لەگەڵ خێزانەکەی لەدیار وەستابوون‌و ژنەکە هەر کە دڵنیا بوو پیاوەکەی دەست بۆ خواردنی دانووەکە نابات، بە هەڵچوونەوە پێیدەڵێت:

—هەی دوژمنی قەلبی خۆ

دە دوو قلان باوێ دەمی خۆ.

**٣٦- ئەوەی قووندەرە:**

سوڵتانێکی عوسمانلی، لەسەربانێکی بەرزی کنار دەریاوە، بە دووربین یەکێك لەنێو پاپۆرێك دەبینێت: ((وا هێدی هێدی هەوڵدەدات سەری عەورەتی خۆی بخاتە نێو قوونیەوە)). یەکسەر فەرماندەدات و:

—هەر ئێستا ئەو پیاوەم بۆ بێنن.

هەر کە دەیبەنە لای‌و پێیدەڵێت:

—ئەوە.. بۆ ئەو ئیشە قۆرەت دەکرد!؟.

ئەویش دەڵێت:

— قوربان هەرچی قووندەرە تۆ.. وەزیفەیەکی گەورەت داوەتێ، منیش هەوڵمدا بچمە ڕیزی قووندەرانەوە تاکو.. وەزیفەیەکم بدەیتێ.

سوڵتان دەلحاز دەڵێت:

— ئەوا تۆم کردە پاسەوانی تایبەتی خۆم.

کابرا یەکسەر دەست بەگریان دەکات.

— ئەوە بۆ دەگرییت؟.

— قوربان پەلەت کردو نەتهێشت سەرەکەی ببەمە ژووری ئەوسا بێگومان دەبوومە سەرۆکی پاسەوانەکانت.

**٣٧-ئەوەی لەدوای من دێت:**

کابرایەکی تەرۆزی فرۆش بەرێگادا دەڕوات و تووشی دووسێ دزورێگران دەبێت.

هەرکە دەی پشکنن پارەی پێ نییە درێژی دەکەن تا ترۆزییەکی لە قوون بڕن.

لەکاتی تێبڕینەکە دا پێدەکەنێت و دەڵێت:

— ئەوەی لەدوای من دێت شارۆخی پێیە.

**٣٨- ئەوەی لێرە کون دەکەیت:**

کچێك پێش ئەوەی مێرد بکات خۆی دۆڕاندبوو. ماڵە مێردی گوارەیان بۆکڕی. ئەویش تا ئەوکاتە گوێی نەسمرابوو.

ڕۆژێك خەریك دەبێت بیسمێت. خەزووری ڕووی تێدەکات و دەڵێت:

—ڕۆڵە ئەوەی لە ماڵە باوکت کون کرد، دەبووایە لێرەت کون بکردبووایە. ئەوەی لێرەش کونی دەکەیت لەماڵە باوکت کون بکردبووایە.

**٣٩- ئەی بەراز**

پیاوێك دوو ژنی دەبێت. ئێوارەیەك پێیان دەڵێت:

—من سبەی دەچمە شار چتان دەوێت؟.

یەکێکیان گوتی:

—پیاوەکە بەخۆت دەبینیت کراسم لە چەند جێیان دڕاوەو کراسێکم بۆ بکڕە.

ئەویتریش دەڵێت:

—ماوەیەکە چاوم دێشێت دەرمانی چاوم بۆ بێنە.

پیاوەش ئەوەندە پارەی نابێت. ئێــ..ە بەلکی دڵیان نەرم دەبێت و پەشیمان دەبنەوە، شەو لەگەڵ هەردووکیان جووت دەبێت.

بۆ بەیانی :

یەکەمیان دەڵێت:

—پیاوەکە دەزانم پارەت کەمە، من ئەو ساڵ ئەو کۆنە کراسە پینەی دەکەم ساڵی پێدەبەمەسەر.

ئەویتریش دەڵێت:

—وەڵلا چاوم چاك بووەتەوەو بەلای نەماوە.

مێردەکەش دەڵێت:

—ئەی بەراز ئەی بەراز

دەرمانی چاو پینەی کراس.

٤٠- ئەی بەراز مەلا:

کاتی خۆی کتێبی مەلایان زۆربەیان جگە لە عیبارەتە سەرەکییەکەی ((حاشیە= پەراوێز))یشی بەوردی لەملاولەولای عیبارەتەکە نووسرابوو.

کابرایەکی نەخوێندەوار، لەکاتی ((متالعە))ی مەلایەکدا دەچێتەلای‌و زۆر بەوردی حاشیەکەسەرسام دەبێت‌و پێیدەڵێت:

— مەلا تۆ.. ئەو..هورد هوردانەش دەزانیت!؟.

— بەڵێ.

ئەویش یەکسەر بەزەردەخەنەی شانازیەوە دەڵێت:

ئەی بەراز مەلا.

٤١-ئەی دەبەرێت مرم سۆرە:

نزیکەی ((٤٠))چل ساڵێك بەر لە ئەمڕۆ پیاوێکی ئەو سەردەوە دەچێتە شاری هەولێرو دەڵێت:

— زگم دێشێت.

هێندە گەنجی شەلاتی ئارەقی دەدەنێ‌و دەڵێن:

— ئەو دەرمانەی بخۆ هەنووکە چاکت دەکاتەوە .

ئەویش پێ سەرخۆش دەبێت‌و لەوساتەدا عەورەتی لەبن شەرواڵی ڕەپ دەبێت‌و ناوە ناوە دەستی لێدەدات‌و دەڵێت:

— ئەی دەبەرێت مرم سۆرە

— ئەی دەبەرێت مرم سۆرە.

٤٢- ئۆباڵت بەم ملە:

لەساڵی ((١٩٦١)) هەزارو نۆسەو شەستو یەکدا هەتا بەیانی ((١١))ی ئاداری ((١٩٧٠))هەزارو نۆسەدو حەفتادا، خەڵکی ئەو گوندانەی لە ژێر دەستی پێشمەرگاندا بوون نەیاندەتوانی سەفەری حەج بکەن. دوای بەیانەکە خەڵکێکی زۆر هاتنە شاری هەولێر بۆ حەج بچن.

یەکێك لە ئەوانەی نیازی حەجی هەبوو لە نێو ((پاس=ئامانە))ی مەسلەحە بەرەوپشت لەسەر کورسییەك دانیشت.

جابییەکە پێیگوت:

— خاڵە نیازت چییە؟

— بەتەمامە بچمە حەج.

جابی هەتا شەپ گرتی لەملی خۆیداو گوتی:

— ئۆباڵت بەوملە.. مەچوو، حەجت لەسەر نییە.

٤٣-ئۆخەی:

کەریمی برام لەکاتی بەسەرداداني کوێت سەرباز دەبێتو لەگەڵ زابتێكو چەند سەربازی عەرەب لە نێو ((ڕەبییە))کی خاکی کوێت دەبن. وێنە ((سەدام حوسێن))ی سەرۆك کۆماری ئەوسا بە دیواری ڕەبییەکەیانەوە دەبێتو لێدەبێتەوە.

کەریمیش زۆربە ڕێزەوە هەڵیدەگرتەوەو خاوێنی دەکاتەوەو دوای ماچ کردنی بەرێزەوە لە شوێنی خۆی دەداتەوە.

زابتەکە عەنتیکەی پێدێتو دەزانێ بەڕاستی نییەو پێیدەڵێت:

— ئەو ڕەحمەت بۆ ماچ کرد؟.

ئەویش دەڵێت:

- لەخۆشەویستیان.

زابتەکە باوەڕ ناکات بۆ ئەوەی پێی دەربخات پێیدەڵێت:

- شەرت بێت ئەگەر ڕاستیەکەم پێ بڵێیت دەڕۆژ ئیجازەت بدەمێ.

ئیجازەش ئەوسا زۆر.. زەحمەت دەدرا .

ئەویش لەخۆشی ئیجازەکەی بە پێکەنینەوە دەڵێت:

- گوتم: ئۆخەی کوردایکی کوردانت گا ئەوهاش دایکی عەرەبانت گا.

یەکسەر ئیجازەکەی دەداتێ.

## ٤٤- ئۆمەرە خێڵ:

خوالێخۆشبوو ((ئۆمەرە خێڵ))ی گوندی ((قوچ))ی ڕۆژهەڵاتی ناوچەی کەندێناوە پیاوێکی ناودارو دەوڵەمەندو خاوەن دیوەخانو سەخیو ناندەر بووە.

بەتەنیا کاتی خۆی گوندەکەی ئاوەدان کردووەتەوە. وا دەوڵەمەند بووە سەردەمایەك حەوت جووتە هێستر هەبووە.

لەژیاندا قسە خۆشو نوکتەباز بووە.

من لە منداڵییەوە سێ واریقاتی = ((سەربردە))ی ئەوم بیستووە کەچی ئەوانی دیکەم لەبرای ئازیزو خۆشەویستم کاك((مەلا عوسمان))ی کوڕەزای ئۆمەرەخێڵم وەرگرتووە. زۆر سوپاس.

فەرموون سەیریان بکەن:

١- بێوەژنێکی تەڕوبڕ لە ئاوایی دەبێت ڕۆژێك ئۆمەرە خێڵ پێدەڵێت:

— گانێکم بدێ.

ئەویش دەزانێت بە سوحبەتێتی یەکسەر دەڵێت:

— ئۆمەر دەتدەمێ، بەڵام نابێ بۆکەس بگێڕیتەوە.

ئۆمەر بەپێکەنینەوە دەڵێت:

— وەڵلا ئەوەندەی هەوەستم بەگانەکە نایەت، وەکی ئەوەندەم هەوەست بەگێڕانەوەکەدێت‌و هەرجارێ لەکۆڕو مەجلیسان بڵێم.

— ((فلانم ئەوهاو ئەوها گایە)).

٢- لەئاخری چلەکان‌و سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا خوالێخۆشبوو ((عەلی خورشید))ی ئاغای گوندی ((قەبلان))ی ناوچەی کەندێناوە ڕۆژێك ((قائیمقام))ی قەزای ((مەخموور))و پیاوە ناودارەکانی دەوروبەر دەعوەت دەکات.

پێش ئەوەی قائیمقام بگاتە جێ پیاوە میوانەکان هەریەکەیان نیازی وابوو بەڕێزلێنانێکی زۆرەوە پێشوازی لێ بکەن.

تەنیا ئۆمەرەخێل دەڵێت:

— مادام ئەنگۆ ئەوەندەتان لا گەورەو بەسامە شەرت بێت من پەنجەی لە قوون ڕابکەم.

ئەوانیش بەگاڵتەوە پێدەڵێت:

— ئەوە قائیمقامە ئۆمەر، ئەمە مانان نییە بەکەیف‌و ماشای خۆت کاروقسەی قۆربکەیت. وەڵلا خاکت لە توورەگە دەکات.

هەرکە دەگاتەجێ پێشوازیکەرەکان، لێکرا بەوپەڕی ئـەدەب و خولـق خۆشییەوە بە پیریـیەوە دەچن و دۆقەی چاك و چۆنی بەسۆزەوە لەگەڵ دەکـەن. ئۆمـەرەخێل دەچێتەلای پشتەوەو تیلکێکی بە پاشەڵیەوە هەڵدەکات.

قائیمقام بەوشتی و توریندانە ئـاوڕ دەداتـەوە ئۆمـەرە خێـل یەکسـەر چنگە لیرەیەکی لەمست دەنێت.

ئەویش بەکەیفسازییەوە وەریدەگرێت.

٣- ڕۆژێـك قەسـاب دەچـنە گونـدی کـاوری لـێ بکـڕن. لەگـەڵی پێکنایەن.

قەسابەکان کاوری براژنەکەی دەکڕن.

ئۆمەر پێیاندەڵێت:

—توخوا عەیب ناکەن کاوڕتان لەگێر ئەستوورێکی وەك مـن نـەکڕی ، کەچی لە قوزگەورەیەکی ئەوهاتان کڕی.

براژنەکەی دەڵێت:

—ئەیەڕۆ ئۆمەر کو دەزانی ئەمن قوزم گەورەیە؟.

بەپێکەنینەوە دەڵێت:

—برای ڕەحمەتیم وایدەگوت.

٤-ڕۆژێـك ئۆمـەرەخێل لـەلای ((مشـیری بـرایم ئاغـا))ی مـەخموور دادەنیشێت. ناوەناوە جگەرەیەك لە قوتووەکەی دەردەهێنێت و دەیکێشـێت. هەرکەبووە چوارپێنج جگەرە مشیر قووەکەی هەڵدەگرێت و دەڵێت:

-جغارەکانمت خلاس کرد.

ئەویش یەکسەر ((قونگە=ئاغزە))کان لەسەر زەوی هەڵدەگرتەوەو شەش دەبن و دەڵێت:

—دامنابوو هەر جغارەیەکت بکێشم لیرەیەکت بدەمێ.

ئەوا شەشم کێشاوە. ها.. ئەوە شەش لیرە.

مشیر ئەوسا قوتووەکەی لەبەردەمی دادەنێت جگەرەی تر بکێشێت، نۆمەر ئەوسا دەڵێت:

—تازە ڕۆیشت و بەکەڵکت نایەت.

٥- لە تازییەکی بنەماڵەی ((بایزی))ی ئاغاواتی دزەیی، لە گوندی ((پیرداود)) کوڕە ئاغایەك ((ناوهێنانی هەموار نییە)) دایکی بێوەژن دەبێت، بەنۆمەر دەڵێت:

—مام نۆمەر وایە دەڵێن: گێرت زۆر گەورەیە.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

—ئەوە دایکت پێیگوتی.

٦-نۆمەرە خێڵ سەردەمایەك هەر دەیگوت: ((شەمێ، شەمێ ئەوگێرەت بەمێ)).

شەمێ ژنی پیاوێکی ناوداری کەندیناوە بوو: ((ناتوانم ناوی بهێنم)).

ڕۆژێك شەمێ لەلای مێردەکەی شکایەت لە نۆمەر دەکات و دەڵێت:

—جوونم پێدەدات.

نۆمەریش پێیدەڵێت:

—دەبڵێ تابزانین جوونەکان چینە.

ئافرەتەکەش بەرامبەر مێردەکەی تاسای دەراندنی ناکاتو بێدەنگ دەبێت.

٧-ڕۆژێك ئۆمەرە خێل لە پیاوێکی ((مشیر))ی ((برایم)) ئاغای مەخموور دەدات. ئەوسا مشیر حاکمی قەزای مەخموور دەبێت. بە ئۆمەر دەڵێت:

—ئەوە لۆ لە پیاوی منت داوە؟.

ئەویش بە پەنجە ئاماژە بۆ پارە ژماردن دەکاتو دەڵێت:

—لێیدەدەم دایکیشی دەگێم ئەوسا من زیاترت دەدەمێ.

مەبەستی پارە بووە و مشیریش بێدەنگ دەبێت.

٨-سەردەمایەکی زوو ئۆمەرە خێل لە ئاوایی ((قوچ)) تەنیا ماڵ دەبێت.

ڕۆژێك خۆشناوێك دووقەرتاڵە ترێ بۆ فرۆشتن دەباتە گوندی ((قوچ)).

ئۆمەرە خێل بە خۆشناوەکە دەڵێت:

—برۆ.. لەسەربان گازی ترێ بکە.

ئەویش بەحەیرمانەوە دەڵێت:

—تەنیا ماڵو گاز کردنی دەوێت؟.

ئۆمەر بە هەڵچوونەوە:

—دەڵێم برۆ گاز کە.

خۆشناو خۆشیو ترشی دەچێتە سەربانو سێجار بەدەنگی بەرزەوە دەڵێت:

—دەوەرنە ترێیان، دەوەرنە ترێیان، دەوەرنە ترێیان.

هەر کەدێتە خوارەوە ئۆمەر بای تەشتێکی پڕ گەنم ترێی لێدەکرێت. بەم جۆرە هەتا هەردوو قەرتاڵەکەی لێدەکرێتو ئەوسا دەڵێتە خۆشناوەکە:

— دەڕۆیت یان بتگێم.

خۆشناو ئەوسا دەڕوات.

❊❊❊

### ٤٥- ئۆی ..لەو درۆیە:

مامۆستایەکی بچم زۆر ناشیرین ڕۆژێک وانەی (ڕێزمان) دەڵێتەوە. باسی ڕستەی ((رابردوو)) و ((ئێستا)) دەکاتو دەڵێت:

— من زۆر ناشرین بووم.

ئەمە بۆ ڕابردووی دوور بەکاردێت.

هەرکە دەڵێت:

— من زۆر جوانم.........

قوتابییەکان نایێڵن تەواوی بکاتو یەکسەر دەڵێن:

— ئۆی..لەو درۆیە!.

### ٤٦- ئیشم بە پاشەوە هەیە:

جارێك جەنابی مەلای کۆیی بەسوار وڵاخ بەرەو شاری هەولێر دەچێت. جەنابی مەلا ئەفەندی ئەوسا سەیارەی دەبێتو بەپێریەوەی دەچێت، لەنزیك کەسنەزان، لە سەیارەکەی خۆی سوار دەکات.

لەگەڕانەوە دا جەنابی مەلا ئەفەندی ڕووی تێدەکاتو دەفەرمووێت:

— من هەلەیەکی گەورەم کرد بەخۆم لە پێشەوە سواربوومەو جەنابیشت لە پشتەوە.

ئەویش دەفەرموویت:

— نا..نا هەلەنییەو من ئیشم بەپاشەوە هەیە.

**٤٧-ئێرە جاستانە:**

ساڵێك بەفرێکی یەکجار زۆر لەشاری هەولێر و دەشتەکەی دەبارێت. کابرایەکی خەڵکی گوندی ((جاستان))ی بنـاری باشـووری رۆژ هـەڵاتی ((زورگە زراو))ی ناوچەی کەندیناوە، شەو دێتە دەرەوەو دەبینێت نزیکـەی دووبست بەفر لەساکە گۆڕ باریوەو هەرواش دەبارێت. ئەو بەفرە زۆرەشی بە عەمری خۆی لەناوچەکەی نەدیبوو. ئەوسا ڕوو لە ئاسمان دەکاتو دەڵێت:

— لێت تێکنەچێت ئێرە جاستانە جاستان گوێستان نییە.

**٤٨-ئێرە وڵاتی:**

سـەگێك بـەناوی گەشـت بـە جیهانـدا دەسـوورێتەوەو دەچـووە هـەر دەوڵەتێك ئەقڵی نەیدەگرتو هەر زوو بەجێیدەهێشت.

ئەمریکاو ئەوروپاو ئەفەریقیای کرد.دواجار هەرکەپێی لەسەر خـاکی ((ئوردەن)) سەنگرایەوە لە خۆشییان شاگەشکەبوو.و دەمی خـەنی وێـك نەدەهاتەوە و هەر دەیگوت:

— ئۆخەی بەڕاستی ئێرە وڵاتی سەگانە!.

**٤٩- ئێوە:**

ڕێزدار خوالێخۆشبوو مامۆستا ((مەحموود زامدار)) دەچـێتە شـاری سلێمانی. هەندێك لە نووسـەران دەعوەتی دەکەن . لەپێشدا بـە ئەنقەسـت شیشـە((گون))ێکی بۆ دەنێرن.ئەویش لە حریتە دەداتو دەڵێت:

—زۆر سوپاستان دەکەم. بەس سەرم سوڕماوە ئێوەی نووسەری سلێمانی هەرکێر خۆربوونە، کەچی ئەمڕۆ.. وابوونە تە گون خۆر.

## پیتی - ب -

**١-با ئێمەش خوێرییەکمان ببێت:**

کێوەلی((حاجی فاتمە))شیان پێدەگوترا. عارەب بوون‌و سەردەمایەکی زوو لە گوندان دەگەڕان . شەوان لەسەر سەکۆی دیوەخان پیاوەکانیان ((ڕەبابە))و دبکیان لێدەداو عەتابەشیان دەگوت. ژنێکیش گۆرانی دەگوت‌و هەڵدەپەڕی . چەفییەکی ڕەشی لەمل بوو.و هەرکەسێك لەکاتی هەڵپەڕیندا درهەمێکی بدابووایە چەفییەکەی دەدایە. هەرکەپشوو دەدرا ئافرەتەکە دەچووە کن.. ئەوکەسەی چەفییەکەی لابوو دادەنیشت.

من لە مێژ نەبوو خۆم ناسیبوو.. و سەرەتای مۆزە مۆزم بوو.. و هەوەستم بەکاری ئەوها دەهات. درهەمێکم لە دایکم ساندو چووم. لەبەر کوڕی ئاغاو جاحێڵی ملهوڕی ئاوایی وەبەرمن نەدەکەوت. براگەورەکەم ((مەلا حەمەدەمین)) زۆر پێ تووڕە دەبێت‌و بەهەڵچوونەوە بەباوکمی گوت:

—لای خۆت باشەلای ناوچەکەیت کوو.ڕازی دەبیت کوڕت بچێتە ئەوقەحپەخانەیە!.

باوکم گوێی پێنەداو ئەویش هەر وازی لێناهێنێت. دواجار پێیدەڵێت:

– لێگەڕێ بابچێت هەموو ماڵێك خوێرییەكیان هەیە، بائێمەش خوێرییەكمان ببێت.

لە ئاخیریشدا بەرم نەكەوت و بەدڵساردی حۆتر حۆتر گەڕامەوە.

**٢-بابم و سەیەبۆر:**

رۆژێك پیاوێك لە گوندێكی دەشتی قەراج ((ناوهێنانی هەموار نییە)) باوكی بەدانی سبیانێ وەفات دەكات، بۆ دانی ئێوارە سەگێكیان دەبێت و دەتۆ پێت. دەڵێت:

– وادیارە بابم و سەگەبۆر لە گرۆیان كردبوو.

**٣-بابی ڕەحمەتیت:**

بێوەژنێك كیژێكی هەبوو بەمێردیدا.. هەركەكچە گەڕاوە دایكی لێپرسی:

– ڕۆڵە مێردەكەت لەگەڵت كووە؟.

– زۆرباشە. پێشتر كەجووت دەبووین سەرم لەسەر بالیفدا دەنا. كەچی لەو دواییەدا گوتی:

– ئەگەر سەرت لەسەر بالیف بێت، دوو سەنتیمەتر دەمێنێت بچێتە ژوورەوە. ئەگەر بالیفەكەی لابدەیت تەواو قەپات دەبێت.

دایكەكە ئاخێكی خەماوی هەڵكێشاو گوتی:

– كەوا تەبابی ڕەحمەتیت چەند كیلۆمەتری من قەرزدارە.

**٤-باخی گون شۆڕان:**

باخی شار لەنێوچەقی شاری هەولێرە. جێیەكی زۆر گرینگی هەیە. پێشتر چ خزمەتێكی وای نەدەكرا و كەم كەس رووی تێدەكرد. هەركە

دەنگۆ.. بلاوبووەوە((وا لە زگە موچەی مامۆستایان زۆر زیادبکرێت))، بەفەرمانی هەر دوو حیزب تاکو زێدەکەیان بەنسیب نەبێت شەش موالیدی مامۆستایان لەسەریەك خانەنشین کرد. هەنجەتەکەش نانە جۆبوو: مامۆستا هەتا ئەو ڕۆژە لەتەمەنی "٦٨"شەستو هەشت ساڵیدا خانەنشین دەکرا، لەسایەی ئەزموونە دیموکراتییەکەی کوردایەتیدا کرا تەمەن "٦٣" شەستو سێ ساڵ. مامۆستایەکی زۆر بەم پیلانە شوومە خانەنشین بوون.

پارێزگای هەولێر بۆ ئەوەی شوێنێکی تایبەت بۆ ئەو خانەنشینانە، تەرخان بکاتو دەنگۆکەش لەسەر زارانی ناحەزانەوە بپەڕێت، ڕۆژانە کاتی لێ بەسەر بەرن هەستا باخی شاری بەشێوەیەکی زۆر باشی نۆژەن کردەوەو مەسرەفێکی وای لێکرد هەرزینەتە ڕۆژانەی لێ بەسەربەریت.لەو ڕۆژەوە نەك مامۆستایان بگرە گشت خانەنشینان دەگرتەوەو ڕۆژانە باخەکە مونجەی دێت.

ئەمەش کارێکی گەلێك ڕەندو پیرۆز بوو.. و خەڵکەکە بەبتوونی دەست خۆشیان لەپارێزگار کرد. بەمە پیلانی خانەنشینە کردنەکە بووە بەردی بن گۆم.

بەس تانەواویش بوو چ ناوی بەسەردا نەسەپاو هەر بەباخی شار ناو دەبردرا. تاکو ڕۆژێك چەند کەسانی خانەنشین لە نزیك دیواری لای شەقامە سەرەکییەکە دادەنیشن . چەند ئافرەتێك لەودیوی ئاست ((موحەجەرە))کەی ئەوان. ڕەت دەبنو یەکێکیان دەڵێت:

— ئەو باخە نۆ ژەلامان کرایتەوە.

یەکێکی دی دەڵێت:

– کچی لۆ هەموو زەلامان نییە. تەنیا لۆ گون شۆڕانە گون شۆڕ.

٥- بادەستنوێژم نەشکێت:

فەقێیەك دەچێتە ماڵێك و دەڵێت:

– تۆ خوا سێڵمان بدەنێ نەختێك ئیشمان پێیە.

تەنیا ئافرەتێك لەماڵ دەبێت یەکسەر کۆشی خۆی هەڵدەداتەوە و بەرەورووی دەچێت‌و دەڵێت:

– فەرموو ئەوە سێڵ.

فەقێیەکەش خۆی لە گوورەنابات‌و عەورەتی خۆی دەردەهێنێت‌و دەڵێت..

– تۆخوا قولفەکەی بەوسینگەی وەبکە با دەستنوێژم نەشکێت.

٦-بارگین- بارگیر:

بارگینێکی پیرم هەبوو کاروباری فەلاحەتی ئەوساڵەی منی پێنەدەسووڕاو ڕۆژێك بردمە شارو فرۆشتم تاکو یەکێکی جاحێڵ بکڕم. ئەو ڕۆژە چ بارگینێکی ئەوتۆم نەکەوتە بەرچاووگەڕامەوە. دوای سێ ڕۆژان چوومەوە مەیدان‌و بارگینێکی خاوێن‌و قشت و قەوچ‌و قەراسەی نوێ لەسەرو هەرچوارپەل ناڵکراو عەقڵم گرتی‌و کڕیم.

هەرکە گەیشتمەوە گردی ((گەمبۆڵان))ی ناوەڕاستی ئاوایی‌و دوای سەلام‌و ماندووبوون لێکردن گوتیان:

– عەولا ئەوبارگینەت بەچەندکرییە؟.

– بە"١٢" دوازدە دینار.

– ئەدی ئەوەکەی خۆت بەچەند فرۆشت؟.

– بە "٤"چوار دینار.

لێکرا لە حریتەیانداو گوتیان:

– کوڕە ئەوە هەر پیرە باراگینە قۆتڕەکەی خۆتە!.

باوەڕم هەرگیز نەهات‌و دایان بەزاندم‌و بارگینیان بەرەللا کـردو ڕووی حۆتر حۆتر لەماڵەوە کرد.

**٧-باکەس لە جێگەی خۆی هەڵنەستێت:**

پاسێکی نەفەر هەڵگری ناوبازاڕ، زۆر بەتیژی لەگەڵ لۆرییەکی گەورە دەعم دەکات.

کیژێکی جاحێلی ناوپاسەکە، لەسەر کورسییەکە دەپەڕێت‌و دەکەوێتە سەرکۆشی کابرایەك و یەکسەر بەدەنگی حیلەوە دەڵێت:

– خزمینە هەتا لیژنـەی تـەحقیق دێـت باکـەس لـە جێگـەی خـۆی هەڵنەستێت.

**٨-بایك حلالنا:**

لەساڵی کـارگێڕانی =((١٩٦٣))هـەزارو نۆسـەدو شەسـت‌و سـێدا. ئەوکارەساتەی عەرەبـی دراوسێ‌و کاربەدەستان بەسەر میللەتی کوردییـان هێنا، باوەڕناکەم بەسەر هیچ میللەتێك هاتووبێت. ئەنفالی یەکەم بوو.

بۆ سەقادانی دڵی دووداڵن لەم ڕووەوە فەرموون سەیری ئەمانە بکەن:

– أحنا بدو..ويناالعەدو.

– أخذنا بسلاح البيچ.

– أحنا العرب أهل الغيرة

— نطرد الكرد من هاالديره

— الرأس لنا والمال لكم

— غير كردي جئت من الجبال

هەرکە سوپای دەوڵەتی عێراق دەگەیشتە هەر گوندێك پیاوەکانیان دەکوشت، یان دەیان گرتن، مێرد منداڵی نێرینەو پیرو ژنو منداڵیش پەراگەندەو دەربەدەر. سوپاکە بەبارەبار دەیگوت عەشیرەتە عەرەبەکانی کوردستانو سەر سنوور: ((

— وەرن ماڵە کوردان تاڵانو فەرهود بکەن)).

بەلێشاوو چاونێشانە گوند بەگوند بۆ تاڵان دەگەڕان بەتایبەتی ناوچەی قەراجو کەندێناوەو دۆڵی ساڵەیی هەر پەڕۆ.. و پاتارێکیان دەست بکەوتبووایە، هەتا سینگولکەی دیواریش، بێ پەردەی شەرمو حەیاوە ڕایان دەپێچا.

هەر کوردێك نقەی بەئاستەم لەبەروە بهات بووایە، بە قوربانی گوللەیان دەکرد. زندەماڵو مردەماڵی ناوچەکەیان نەهێشت.

سوپاکەش ((دیاردی))ی تاژیانەی لێدەکردن. کافری حەوت دینانیش زگی بە میللەتی کوردی ژێر چەپۆكو بێ ئەنوا دەسووتا. تەنیا عەرەبە دراوسێکان نەبن. لەتاوایی "لهێبان"ی ناوچەی کەندێناوە عەرەبە فەرهود چییەکان دەغڵێکی یەکجار زۆریان خڕکردەوەو بەکاروانێك بۆیان نەچوو.و چەند کەسیان نارد لۆری بهێننو بیبەن

جوتیارێکی گوندەکە پەرپووت کرابوو. تاکو باراشی ڕۆژانەشیان نەهێشت بوو، لەتاوبرسێتی خوارە گەنمێکی دەغڵە کۆ کراوەکەی دەبات بۆ

نانی ڕۆژانەی. یەك لە عەرەبە تالآنکەرەکان دەزانێت‌و دەچێت، لە ژووری ماڵی خۆی گوللەیەکی لێدەدات. چابوو ئەجەلی نەهاتبوو.. و پاش ماوەیەك چارەو تیمارکردن ئەوجا چاك دەبێتەوە. بەعەرەبە فەرهود کەرەکەیان گوت:

— ئەوە بۆ ئەو گولەیەت لێدا!؟.

بەوپەڕی هەڵچوونەوە گوتی: ((

— هاد الکلب بایك حلالنا)) ئەوسەیە ماڵی حەڵاڵی ئێمەی دزیوە.

٩-بەبێ مەلا:

پیاوێك ژنەکەی نەخۆشییەکی وای تووش دەبێت کەڵکی جووت بوونی نامێنێت.

بەبرادەرێکی خۆی دەڵێت:

— چارەیەکم بۆ نابینیتەوە.

ئەویش دەڵێت:

— بڕۆ.. کەرێ بگێ.

— گوناحە.

— لەتۆڵەدا هەندەی جۆی بدێ.

— ئەوهاش هەرگوناحە.

— پرسی مەلابکە.

کابرا تۆزێك دادەمێنێت‌و دەڵێت:

— بەبێ مەلا نایکەم.

**١٠-بەخۆت و ئیمامی شافعی:**

کابرایەك نوێژی دەکردو یەکێکی تر ئامۆژگاری کردو گوتی:

-بەمەزەبی ئیمامی شافعی ئەوها نییە، ئەوهایە.

لە پێگوتنی هەڵەی دووەمدا، کابرای نوێژکەر بایەکی لێ بەردەبێت و دەڵێت:

بەخۆت و ئیمامی شافعی وازنان لێنەهام هەتا دەسنوێژەکەتان پێ شکاندم.

**١١-بەدوکەوتن:**

بەبیرم دێت پیاوێك ماڵی لەشاری هەولێر بۆ سەپانی کردن هێنا گوندەکەمان و بووە سەپانی یەك لە فەلاحەکانی ئاوایی ((ناوهێنانی هەموار نییە)). کوڕێکی جاحێڵ ژنەکەی هەڵگرت. پاش دەڕۆژان ژنەکە هاتەوەو مێردەکەی وەریگرتەوە.

ئێمەی منداڵ ویستمان ژنەو پیاوەکەی بە پلووکە بەردان وەدەرنێین کەچی جوامێرو ریش سپیی ئاوایی نەیانهێشت.

**١٢-بەرگەی ناگرم:**

ژنو مێردێك زۆر.. ڕێك و پێك دەبن. پارێزەرێکی ئافرەت دەگرن تاکو لە "دادگا"دا لەیەکتریان جوودا بکاتەوە.

پارێزەرەکە هەرکە دەزانێت لەسەرچییە بە پیاوەکە دەڵێت:

-ئەگەر من مارەبکەیت محامیتان بەلاش بۆ دەکەم.

ژنی یەکەم گوتبووی "بەرگەی ناگرم".

**١٣-بەرووتی بیبینە:**

پیاوێك ژنێكی زۆر ناشرینو دەعەجانی دەبێت. دۆستێكی دڵسۆزی پێیدەڵێت:

— برام ژنەكەت زۆر ناشیرینە.

ئەویش دەڵێت:

— بەڵێ لەدەمو چاو ناشیرینە، بەڵام بە ڕووتی بیبینە چەندی بڵێیت جوانە.

**١٤-بەرووڵەی گوڵ بە دەم:**

كابرایەكی شاری سلێمانی تەرۆزی لە بازاڕ دەفرۆشت. تەرۆزی سەرلەبەیانیان تازە لە بڕك كراوەتەوەو زۆر تەڕو ناسكو كولیكەی گەشی پێوەیەو بانگی دەكردو:

— وەرن بەڕووڵەی گوڵ بەدەمو بەمێ. وەرن بەڕووڵەی گوڵ بەدەمو بەمێ.

هەركە ئێوارە دادەهات، تەرۆزییەكە سیس دەبووو كولیكەكەشی پووتو دەوەری دەیگوت:

— وەرن بەڕووڵەی كێرم و بەمێ. وەرن بەڕووڵەی كێرمو بەمێ.

**١٥- بەڕێوەبەری قوتابخانە:**

لەو قوتابخانەی من لێی بووم بەڕێوەبەرەكەی ((شێخ)) بوو. ((ناوهێنانی پەسەندنییە)). هێشتا نەبوو بوو بەڕێوەبەر .. زۆر درەنگ دەهاتە دەوام.

بەزۆری دەرسی یەكەم. تو بڵێت دەرسی دووەمیش نەدەهات.

هەرکە بەڕێوەبەر پێیدەگوت:

— بۆ..درەنگ هاتیت؟.

یەکسەر دەیگوت:

— لەبەر ئیشوکاری دەرویشان پێڕاناگەم.

جارێك بەڕێوەبەر بەتوورەیی یەوە پێیدەڵێت:

— دیسان تاخیر بوویت؟!.

بەهەڵچوونەوە گوتی:

— تازە دووکەسم لە حوکمی ئیعدام رزگار کرد.

هەرکە خۆی بووە بەڕێوەبەر. نیوسەعات بەلای کەمییەوە پێش مامۆستایان دەگەیشتە قوتابخانە. هەندەجار پێش فەراشیش دەکەوت.

ئەمانەی لە قوتابخانە ئەنجام دەدا.

١-بەشاپان لە پاشەڵی قوتابییانی دەداو جاتاتف دەگرت لە دورِ چاوی دەکردو دەیگوت:

— سەی لەبابی سە ئەوە دایکت چاك نییە، دایکت.

٢-ڕۆژێك بەڕێوەبەرو منو مامۆستایەکی دیکە "ناتوانم ناوی بهێنم" لە حەوشەی قوتابخانە راوەستا بووین. مامۆستایەکی ئافرەت سفوورو تەندوورەیەکی زۆر تەسكو کورتی لەبەر بوو. تۆزێکیش گۆشتن، ئەستوورایی ڕانی بەدەرەوە، بەلامان تێپەڕیو چووە ژوورەوە.

بەڕێوەبەر هەر دووڕناوِ لەپی توند بەیەکدادانو ڕووی لەمن کردو گوتی:

— ئۆی.. لەو سمتە سپیو لووسو جوانەی خودایە!. تۆ چ جار دەستت بۆ نەبردییە؟.

منیش یەکسەر گوتم:

— ببورە ئەمن شێخ نیم.

لەباتی بەسەرخۆیدا بشکێتەوە بەپێکەنینەوە گوتی:

— وەڵلا خۆ ڕاست دەکەیت!. هەرشێخ ئەو عەمەلانەیان هەیە.

٣-هەمان مامۆستای ئافرەت داوای دوو ڕۆژ ئیجازەی کرد. بەڕێوەبەریش کیتابی بۆ کرد. دوای ڕۆیشتنی لە نوسخەی دووەمی کیتابەکە، کەلە ئیدارە دەمێنیتەوە، بەقەڵەم ماجیکی سوور وێنەی "کێر"ی لەسەر کردو بانگی مامۆستایانی کردو گوتی:

— وەرن، وەرن چ عاجباتییەك نووسراوە، خۆ ڕاستیشە.

نووسینەکەشی خوێندەوە، کەلەژێر وێنەکەی نووسیبووی:

— ((پێویستی بەمەیەو بەس)).

**١٦-بەشەرەفت:**

کوڕێك لە هەندەران دەگەڕێتەوەو باوکەکەی حەبێکی دەداتیو پێیدەڵێت:

— ئەوە حەبی زگ ئێشانەو لێرە دەست ناکەویت، کە چوویتەوە بۆم بنێرە. کوڕەش هەرکە سەیری حەبەکەی دەکاتو دەڵێت:

— بەشەرەفت ئەوە حەبی زگ ئێشانە یاحەبی دایك گانە.

**١٧- بەشەشان نەتاندەزانی:**

ئافرەتێك مێرد بە كوڕێك دەكات پێنج برای دەبێت زاوا دەمرێتو ژنەكە مێرد بەبرای دووەم دەكات. بەم تەرزە هەتا پێنج برایان بەڕێدەكات. ئەوسا مێرد بەشەشەم دەكات.

ڕۆژێك مێردەكەی لێیدەداتو سەری دەشكێنێت. ژنە دەست بەگریان دەكاتو دەڵێت:

—حەقتە بەشەشان نەتاندەزانی كەریش بگێن هەمووتانم فێرە گان كرد. هەنووكەش لێمدەدەیت.

**١٨- بەعەرەبی ئەمنیان كوشت:**

((بەرخۆلە)) شێتێك بوو لەشاری هەولێر.

لە زەمانی بەعسی گۆڕبەگۆڕ چووداشەوێك لەسەر شەقامی شار دەكەوتە بەر چاوی سەربازو جەندرمەی بەعسەوەو بەچەك هەڵكێشان لێی دەڵێن ((قف)) = بووەستە.

ئەویش دەترسێتو لە جیاتی ڕابوەستێت غار دەدات. تەقەی لێ دەكەنو بەسەختی بریندار دەبێتو دەیگەیەننە نەخۆشخانە و دەڵێت:

—بەعەرەبی منیان كوشت.

دوای چەند ساتێك گیانی دەردەچێت.

**١٩-بەقەدەر:**

بێوەژنێكی شارۆچكەی ((كۆیە)) بەكرێ لە خانووی خوالێخۆشبوو مەلا حەویز دەبێت.

کاتێك تاپۆ دەچێتە شارۆچکەکەو خانووان تاپۆ بکات بێوەژنەکە دەڵێت:

— ئەو خانووە هی خۆمە.

ئەوانیش دەڵێن:

— نەخێر هی مەلا حەوێزە.

ژنە دەڵێت:

— ئەو خانووە چەند بەردی تێدایە؟.

— یەکجار زۆر.

ئەوسا بێ پەردە دەڵێت:

— مەلا حەوێز بەقەدەر ژمارەی بەردەکان ئەمنی لەناو گایە.

ئەوسا مەلا حەوێز ناچار دەبێتو دەڵێت:

— بەڵێ خانووەکە هی جەنابتە.

**٢٠-بەقسەی خاڵم بکەن:**

پێشمەرگە کابرایەکی سەر بە ئیستخباراتی حکومەتی ((بەعس)) دەگرن.

یەکێکیان دەڵێت:

— بیکوژین.

یەکێکی تر دەڵێت:

— ناوەڵلا هەتا لەپێ دەکەوێت لێی بدەین.

بەختیارەکەیان دەڵێت:

ناوەڵلا بیگێین

کابرای گیراو یەکسەر دەڵێت:

—بەقسەی خاڵم بکەن بەقسەی خاڵم

**٢١-بەلە ڕووس‌و عەنتەرناش:**

خوالێخۆشبوو "زەعیم"ی گەلی عێراق‌و نیشتمان پەروەر ((عەبدولکەریم قاسم)) بۆ ئەوەی چینی جوتیاری چەوساوە و ژێر چەپۆکی دەرەبەگان، لەکەرەستەی کۆنی کێلان‌و دروێنە رزگار بکات تەرەکتەرو دەراسەی بۆ ناردن. بەناوی ((ئیسلاحی زراعی)) یەوە.

تەرەکتەرێکیان ڕەنگی سوور سوور بوو. ((بەلە ڕووسی))یان پێدەگوت. ئەویتر زەرد. ئەگەر لێمنەبێتە درۆ ((عەنتەر ناش))ی ئەمەریکی ناوبوو.

خەڵکەکە لێکڕا بەلە ڕووسیان خۆشتر دەویست . سەیوانێکی لەئاست سەری شوفێر هەبوو. دەیانگوت:

—لەبەر ئەوە ڕووس کرێکاری خۆشدەوێت، بۆ ئەوەی لەکاتی ئیش کردندا سەرماو گەرمای نەبێت سەیوانیان بۆ دروست کردووە کەچی ئەویتر هی ئیستیعمارەو وانییە.

ڕۆژێك شۆفێرەکان گوتیان:

—واباشە تەرەکتەرەکان تاقی بکەینەوە.تاکو بزانین کیهان بەهێزترە.

زنجیرەیان لەپشتەوەی هەردووکیان خست‌و دوو شۆفێری بێلایەن ((نەرەجعی، نەنیشتمان پەروەر)). تەرەکتەرەکانیان بەیەکەوە گرێدا.

خەنکەکە زووربەیان هانی بە نە رووسیان دەداو دەیانگوت. ((

– لەوچاوەتە بەلە رووس خێرا سـەری نیسـتیعمار شـۆربکە. دەی دەی بەلە ڕووس گیان)).

کاتێك دیترا عەنتەرناش بەلە رووسی کردە کوچکوچە. هاندەرەکان لە جێگەی خۆیان سارد بوونەوە. خۆشم یەکێك بووم لە بینەران.

**٢٢-بەندکردن:**

سـاڵی ((١٩٦٧)) چـوومە سـەردانی ماڵـە خاڵوانـەکانم لەگونـدی "گورزەبی"ی بەرامبەر مەرقەدی ((وەکاشە)).

سوپای عێراق بۆ پشـکنین هاتـە ناوچـەکەو خـەڵکێکی زۆری گـرت منیش وەگەڵ کەوتمو ((٤٠)) ڕۆژ گیرام.

قاتێکی نوێم کڕیبوو، دەلینگی پەنتلۆن تا ئەو ڕۆژە لێواری هـەبوو.و تازە مۆدیلی "فلات" دەلینگ ڕاسـت دەرچـوو بـوو. حەپسـەکان زۆر پـێ سەرسام بوونو تاماوەیەك سەیریان دەکرد.

نائیب زابتێکی کـوردی لێبـوو هەرکـە زانـی مـن ((موعـەلیم))م بەتەوسەوە گوتی:

– مامۆستا لەمەودوا منداڵی فەقیران هەر ناجیح بکە.

منیش گوتم:

– ئەگەر ناجیحیشیان بکەم غێر یەکێکی وەك تۆیان لێدەردەچێت.

حەپسەکان لێکرا پێ گەشانەوە.

**٢٣-بەو قورئانەی:**

دوو فەقێ دانی سبیانەیەك بەرێگادا دەڕوون. ((شفتی فروش))یکیان تووش دەبێتو بەئەو شوێتیان دەداتی.

فەقێیەکان هەتا هەنگڵیان دێشێت شفتی دەخۆن ..جا میز بە ئەوەی لەبەریان مابووەوە دادەکەن.

دانی ئێوارە گەڕانەوەو زۆریان برسی دەبێتو هەریەکەیان لەکاتی خواردنی پاشماوەی ((شامی))یەکان دەڵێت: بەو قورئانەی بەخۆم ((بیسمیللا))م لێکردووە من میزم بە ئەوەیاندا نەکردووە.

هەتا پاشماوەکەی هەموو دەخۆن.

**٢٤-بەوی دیش:**

کابرایەك لە گوندێکدا بە((دووکێر)) مەشهوور بوو. گوایە دووی هەیە. ئافرەتێك مێردەکەی زۆر گێلو کەمفام دەبێت باوەڕدەکات کە دووی هەیە و پەیوەندی لەگەڵ پەیدا دەکات.

ئۆمەر لە نیوەشەوێکدا دەچێتە گڤ.ژنەکە.لەتەك مێردەکەی نووستبوو.

لەکاتی ئاخرو ئۆخری لێبوونەوەدا، ژنەکە یەکسەر دەڵێت:

-بەویدیش، بەویدیش.

پیاوەکەی بەدەنگەکە بەخەبەر دێتو دەڵێت:

-ئەوە چییە کچێ ئەوە چییە!؟.

دوو کێر دەردەپەڕێتو عەورەتی تەڕی بەلا ڕوومەتی مێردەکەی دەکەوێت.

ژنە دەڵێت:

—خەوم دیت: لامووابوو تو لەناو رووبارێکدا ماسیت بە دەستێك دەگرت. منیش گوتم:

— بەویدیش، بەویدیش. واتە بەدەستەکەی دیکەشت.

پیاوەکە باوەڕی دێتو دەڵێت:

— خۆ.. ڕاست دەکەیت شاپەڕی ماسییەك بەلا ڕوومەتی من کەوت.

**٢٥- بەهارێکی زۆر خۆش بوو:**

مەڕ دارێکی یەك لەعەشیرەتە کۆچەرییەکان ، پاش بە سەرچوونی وەرزی بەهار لە کوێستانان گەڕاوەو برادەرێکی خۆی پێیگوت:

— بەهارەکەتان ئەم ساڵ کوو بوو؟.

ئەویش گوتی:

— بەهارێکی یەکجار زۆر خۆش بوو. ئێمە هەرسێ برا گچکە ڕەشماڵیان لەتەك یەك بوو. هەریەکەمان ژنی ئەویدی دەگا. کەچی ڕەشماڵی برا گەورەکەمان کەمێك دوور بوو. کەدەهاتە لامان ژنی هەرسێکمانی دەگا.

**٢٦-بڕمووت:**

بڕمووت توتنێکە وەك کل وردکراوە. هێندەکەس لەکاتی کەپووگیراندا تۆزێکی هەڵدەکێشێت. دەلحاز لووتی دەبێتەوە. چەشنی جگەرەیە ئەگەر کەسێك فێری بوو زەحمەتە بتوانێ وازی لێبهێنێت.

جارێك پیاوێك لەگەڵ هەڵکێشانی بایەکی لێبەر دەبێتو جا دەڵێت:

— بڕمووتێکی زۆر بەقووەتە.

ئەوەی تەکییەوە بەبزەیەکەوە دەڵێت:

-بۆیە هەموو کەس بەرگەی ناگرێت و دەیترێنێت.

۲۷-برنجە سورکە:

چەند فەقێیەك لە گوندیك دەعوەت دەکرێن. یەکێکیان یەکجار زۆر لەحەدی خۆی زیاتر دەخوات و توانای ڕۆیشتنی بە پێیان لەبەرەوە نامێنێت. هاوڕێکانی ناچار گوێدرێژێکی بۆ پەیدادەکەنو پێش ئەوەی بگەنەوە گوندەکەی خۆیان گوندێکی دیکەیان لەسەر ڕێگا بوو. یەکێك لە خەڵکی ئاوایی دەچێتە پێشیانو دەڵێت:

— دەبێ بۆ ئێوارە بێنە زیافەتی من.

ئەوانیش چیبیان پێنەدەخوراو بۆ ئەوەی لەکۆڵ خۆیان بکەنەوە گوتیان:

— ئەو فەقێیەکەی سواری کەر بووە گەورەمانە.

هەرکە پێیدەڵێت ، فەقێیەکە دەڵێت:

— شیوەکەتان چییە؟:

— برنجە قوریان.

یەکسەر .. ڕووی لە هاوڕێکانی دەکاتو دەڵێت:

— ئادەی فەقێینە برنجە سوکە سەری کەرێ وە سووڕێننەوە.

۲۸-برۆ بیدێ:

دوو جوامێر دۆستی گیانی بە گیانی یەکتر، یەکێکیان ڕۆژێك دەچێتە لای خێزانی ئەویترو پێیدەڵێت:

— بۆ بە مێردەکەت ناڵێیت: هەر داوای گانم لێدەکات.

ژنەش یەکسەر دەڵێت:

— لێیمەترسێ برۆ بیدێ.

### ٢٩-بريا باوكمي بكوشت بووايه:

كابرايەكي كـورد بەسـەيارە لـە سـەگێكي مالـە عـەرەبێك دەدات‌و دەيتۆپێنێت. كوردە سێ چوار پياوي ماقوولّي دەورووبەري خۆي دەبات‌و بـۆ تەوازوو خواستنەوە دەچـنە مـالّي عەرەبەكـە. عەرەبەكـە زۆري هەوەسـت پێدێت‌و ڕێزيان دەگرێت‌و دەلّێت:

—مادام ئێوە تەشريفتان بۆ مالّي من هێناوەتـەوا مـن لێيخۆشـبووم، بەلاّم بريا باوكمي بكوشت بووايە نەك سەگەكە.

### ٣٠-بريا بتزا نيبووايە:

پياوێك ژنێكي زۆر خراپ‌و دەم شڕي دەبێت.. شەوێكي ساردي زسـتان هەوەستي هەلّدەستێت‌و چەندتان لەخۆي دەدات تاسا ناكات بانگي بكات.

ئەو زەمان ولاّخي باربەر وەك ئۆتۆمبێلي ئەمڕۆ ڕەواجي هەبوو.. و بـۆ ئەوەي شەوان نەدزرێت دەرگـاي تەويلـە="پشـتير" ژووري ولاّخـان لـەنێو ژووري مالّـەوە بـووە. كـابرا گـڕي حـەزي هـاني دەدات‌و دەچـێتە گـژ مارەكەرەكەيان. كە دەستي بەردەبێت پێيدەلّێت. ((

—بريا بتزانيبووايە پـارە سـاوارێك لـێ بنێيـت نـەوكات نيشـم بـەو عزرانيله نەدەما)).

### ٣١-بژەن بژەن:

مام عەولا ناوێك بە پيرەژنێك فێر دەبێت.

ـۆفي ((حەسەن)) ناوێـك هەسـت پێـدەكات. ئەوسـاش دێهاتـەكان كارەبايان بۆ نەچوو بوو.و شەو تاريك بوو. دەچێتە گژ.. ژنەكە.

ئافرەتەکە هەر زوو هەست دەکات چێشتەکەی لەهی مام عەولای گەورەترەو دەڵێت:

— بژەن بژەن بێ بەلابی.

زەحمەت ئەتوو مام عەولا بی.

سۆفی بەجەواب دێتو دەڵێت:

— من عەولا نیمە، سۆفی حەسەنم

فەتەق ئەمن زۆر باشتر دەژەنم.

**٣٢- بنیادەمە شەوە نییە:**

خوشکێکی نەقوستانم هەبوو. چەپو چوێرو ڕەشو زۆر ناشیرینو دەموچاو لیرلپرو بەموو.. و کورتە باڵا. عاجباتییەکی وابوو بە ڕۆژ بتدیتبووایە ، بەشەو دەهاتەوە خەونت. لە بێ بەختییەوە کەس نەهاتە داخوازی تاکو بەرێگەی خۆیدا برۆیشت بووایە. خواش نسیبی هەڵنەقەناندبوو.

ڕۆژێك بۆ کەلو پەل کڕین لەگەڵ خۆم بردە شاری هەولێر.

من بۆ نوێژی جومعە چوومە مزگەفت و ئەویش چووە ماڵێك. هەر کە گەڕامەوە دیتم پێش ئەو ماڵەی ((عەیشۆك))ی چووبووێ، لە ژنو منداڵو توال سیەی دەهاتو دەرزیت هەڵ بدابووایە، بەعەردی نەدەکەوت. لەدڵەوە هەترشم چوو.و گوتم: ((

— ئیللا بیللا خوشکۆلەم شتێکی بەسەر هاتووە!)).

لەشروان بەرچاوم تار هەڵگەڕاو گوێم بەعەشاماتە زۆرەکە نەداو خۆم فجورکرد: ناوڕاستو بە هەردوو دەستان درم بە کۆمەڵی خەڵکەکەوە

دەداو کاتێـــك پـــێم لـــە ژووری ســـەنگرایەوە بینـــیم عەیشـــۆك بـــەزنجیر بەستراوەتەوەو ((سووژن))ێکیشی لەبەرۆك دراوە.

تومەز ماڵەکە دوو ڕۆژ بوو منداڵیان بـوو بـوو.و بـە ((شـەوە))یـان حەملاندبوو.

هەرکە چاوی بەمن کەوت لـە هـۆڕ ژنـی گریانیـداو پـاش ماوەیـەك بەنزگرەوە گوتی:

—هێزەو سوو دەخیلت بم هەتا زووە لە دەستیانم قوتاربکە.

بەهەزار سوێندو ناڵی عەلییەوە هەتا بڕوایان هات: بنیادەمـە، شـەوە نییە.

..................................................................

(١) ئەمە لەشاری هەولێر ڕوویداوە.

**٣٣-بووك‌و زاوای کەسك و زەرد:**

کوڕێك ژن دەگواستەوەو هەرکە بووك دەگاتە ماڵی زاوا، دایکی بووك ئەوسا دەزانێـت: زاوا لـە حیزبـــی ئـەوان نییـەو سـەر بـەحیزبێکی تـرە. هاروهاج دەبێت‌و بەخۆی ناوەستێت‌و تەنگەتاو دەچـێتە مـاڵی زاواو داوای کچەکەی دەکاتەوەو دەڵێت:

— کوفرە کەسك‌و زەرد بەیەکەوە بژین.

دوای تکـاو ڕجایـەکی یـەکجار زۆر خەسـووەکە بەغەزەبـەوە ڕوو لـە کچەکەی دەکات‌و دەڵێت:

– چارپان دیاره لۆ مێرد ئاگرت تێبــەر بــووە. ئەگــەر نــا کــوو بێــزت دەهات: مێرد بەو خائینەی بکەیت..

ئیتر لە تەشکی خۆی دەدات و دەگەڕێتەوە.

ئەمە لە شاری هەولێر ڕوویداوە.

**٣٤-بووك و زاوای کۆن و نوێ:**

گەنجێك ژن دەهێنێت و لەیەك لە ئوتێلەکانی شــاری بەغــدا مــانگی هەنگوینی = ((شهر العسل))ی بەسەر دەبات. زاوا هەموو ساڵێ لە ڕۆژی بە زاوابوونیدا لەگەڵ ژنەکەی دەچوونە ئوتێلی گــۆرین و لەهــەمان ژووردا شەویان بەسەر دەبرد.پاش چەندین ساڵ بووك و زاوا پیر دەبن و ئــەو شــەوەی لە ئوتێلەکەی بەسەردەبەن، بە ڕێککەوت بووك و زاوایــەکی نــوێ مــانگی هەنگوینی لێ بەسەر دەبەن. خاوەن ئوتێل بڕیار دەدات شەو ڕاشــکانێ لــە کونی دەرگاوە سەیریان بکات.

یەکەم جار تەماشای نوێنەکە دەکات و دەبینێت. ((

زاوا لەسەر تریقەی پشت درێــژ بــووەو عــەورەتی ڕەپــەو بووکەکــەش مــەترێك زیــاتر لێیــدوورەو بازنــە زێڕەکــانی دەســتی یەکــە یەکــە بــۆ تێهەڵدەدات)).

ئەویتریش ژنە درێژ بووەو لینگی قوچ کردووەتەوەو پیاوەکەش گــوێزی تێدەگرێت. تاك و تەرادەکــەو تــەناوی و ســانییەك گــیر دەبــوو.. و دەکەوتــە خوارەوە.

### ٣٥-بووكی كۆن و نوێ:

لە زەمانی زوودا بووك زۆر شەرمن و فەقیر حاڵبوو. ئەگەر یەكەم شەو یەك و دووجار لەگەڵ بكرابووایە تاسای هەرگیز نەدەكرد نارەزایی خۆی دەربڕێت. كەچی بووكی ئەو زەمانە ئەگەر هەتا شەبەقی بەیان لەسەری بێیتە خوارەوە پەنجەت لە قوون رادەكات و دەڵێت:

-یاللا دەی... ئەدی منت بۆ هێناوە.

### ٣٦-بۆش:

خوا لێخۆشبوو: ((مەلا عەلی))ی گوندی ((لاوەر))ی ناوچەی كەندێناوە، ئاوزەی من بوو . یەكترمان زۆر خۆشدەویست و زۆرمان بەیەكەوە خوێندبوو. جارێك لەگەڵ كاكم بە سەردان دەچنە ماڵێكی پێشكەوتووی سەردەم: ((بەداخەوە ناوی ماڵەكەم لەیاد نەماوە)). ماڵەكە زۆر رێزیان دەگرن و نیوەڕۆ شیوی برنجیان بۆ لێدەنێن. لەتەك ((لەنگەری)) یە پلاوەكە فەخووری ((بۆش))و ملاك لەناو لەسەر سفرەكە دادەنێن.

تازەش پەیدابوو بوو.. و مەلا عەلی نەیدیبوو.و زۆر پێ سەرسام دەبێت و بە خۆی گێڕایەوەو گوتم:

—تەماشای كاكۆك دەكەم ئەو چی كرد منیش چاو لەو دەكەم.

((ئێمە خوشك و برا بەبراگەورەكەی خۆمان دەگوت: كاكۆك)). ئەویش لە خۆشەویستی ئێمە بەكاكۆكی ناودەبرد.

گوتی:هەر كەدیتم: كاكۆك فەخوورییە بۆشەكەی دەستەدایەو بەكەوچكان پلاوی هیدی هیدی تیكرد منیش چاوم لیكرد.

لە زەماوەندیکی ئاغای گوندەکەمان یەك لەو ژنە ئاغایانەی لە دوای گێرِدرابووەوە: ((ناو هێنانی هەموار نییە)) ڕوو لە ژنە ئاغاکان دەکاتو دەڵێت:

— ئەریٚ ژنە کرمانج دەیانزانی شیو لە بۆش بخۆن؟.

دایکم یەکسەر تێدەگات مەرامی چییەو پێیدەڵێت:

— ئەنگۆ بۆشتان دانەهێناوە هەتا کەشخەمان لەسەر لیٚ بدەن. لە ژنانی شار فێربوونەو با ئێمەش لە ئێوە فێربین چیتێدایە:

— مەلا ژن کەس لەگەڵ تووری نییە.

خوا لێخۆشبوو ((ئاسیا خان))ی کچی ئاغای گوند زۆری کەیف پێدێتو ڕوو لە دایکم دەکاتو دەڵێت:

— دەگ زارت خۆش بێت!. توخوا ئەو قسە قۆڕە هی ئەو ڕۆژە خۆشەیە.

**٣٧-بۆ مەلا لە مەلاژن دەترسێت:**

خوالێخۆشبوو: ((مام برایم کاروان))ی گوندەکەمان بە خوالێخۆشبوو: ((مامۆستا مەلا سەعید))ی باشتەپەی گوت:

— ئەنگۆی مەلا لۆلە ژنی خۆتان دەترسێن.

ئەویش گوتی:

— برایم کاروان ئێمە حەقمان لە ژنی خۆمان بترسێین.

— لەبەرچی؟.

— ئەنگۆی فەلاح لەجوتی بێت. یان لە جەنجەڕ گێرەدا ئیحتاج خۆتان جیٚ بەجیٚ دەکەن. بۆیە ئێوە پێویستتان زۆر بەژنەکانتان نییە. کەچی

ئێمەی مەلا هەیەو نییە مەلا ژن. خۆ ئەگەر وەك ئێوە بچین لە کەندو لەندان بگەڕێین ئەوسا ئێوە دەڵێن:

– ئەها..مەلا.. وا بە مەندیلەوە لەکەر گانێ دەگەڕێت.

### ٣٨-بیر قز، یان بیر ئۆغلان:

ئافرەتێکی پەروەردەی ناوشاری هەولێر بۆ منداڵ بوون دەچێتە سەر گۆڕی ((شێخ جامی))و ئاوەڵکراسەکەی لەپێ دەکاتەوەو خۆی بەکێلی قەبرەکەی دەقرمسێنێت‌و دەڵێت:

یاشێخ جامی بیرقز، یان بیر ئۆغلان. بەس ڕەش‌و پرش نەبێت وەکو بابی، خڕوپڕ بێت وەکو دایکی.

### ٣٩- بیگرە دایکی بگێ:

من لە حەفتاکانی سەدەی رابردوودا بەڕێوەبەری قوتابخانەی گوندی ((مورتکە))ی گەورە بووم. ماڵیشم لەشاری هەولێر بوو. ڕۆژانە ئامەشۆم دەکرد.

ساڵێك کاتی قوتابخانە کردنەوە، یەکەم ڕۆژی دەوام لەگەڵ مامۆستاکان چووینەوە دەوام، هەرکە گەیشتینە قوتابخانە، پیاوێکی ئاوایی، ئەماوەو ((ناتوانم ناوی بهێنم)) یەك تاکە کوڕی هەبوو.. و لە خوێندندا تەمبەڵ بوو.. و وازی لە قوتابخانە هێنابوو، لە بریتی چاك‌و چۆنی‌و ماندوو بوون لێکردن، لە پشتەوە کلکی کۆپاڵی لە ملم وەژاندو گوتی: ((مەلا عەزیز، مەلا عەزیز دەبی ئەو ساڵ کوڕەکەم وەرگرییەوە)).

زانیم مامۆستاکان بەکارە دزێوەکە: ((دار لە مل وەژاندن بۆ گوێدرێژ بە کاردێت)) هەڵچوونو دگە دگیان لێوە دەهات، بەڵام مـن بـەتی چـاو هێورم کردنەوەو ڕووم لە کابرا کردو گوتم:

— ئاخر کوڕەکەت ناخوێنێت، تا.

یەکسەر گوتی:

— ئەگەر نەیخوێنند بیگرە دایکی بگێ.

گوتم:

—باشە.

٤٠- بێبەش:

مامۆستای خوالێخۆشبوو: ڕێزدار ((مەلا مەسعود بێبەش)) فەرموویەتی:

١- پیاو کە پیر بوو ژن پێیدەویستێ لە جیاتی کیژی زەختی هەڵدەستێ.

٢- لەززەتی پیاو دادانو کێرە کە ئەو دووەت نەمان مرددنت خێرە.

٤١- بێزم نایەت:

لەساڵی "١٩٥٨" هەزارو نۆسەتو پەنجاو هەشت، مانگی حوزەیران، بۆیەکەمجار لەگەڵ ئامۆزایەکم لە دێی: ((مەلکەتێن))ی ناوچەی سیوەیلو شار بازێڕ چووینە ماڵە ئامۆزایەکمان لەگوندی ((لال هۆمەرە))ی ناوچەی پێنجوێن.

ئامۆزای میوان تیلکێکی به پاشەڵی ((عەلی))ی کوڕە ئامۆزای خانە خوێ هەڵکرد. عەلی تەمەن حەوت ساڵ، ئێستاش لە ژیاندامارە ڕووی تێکردو گوتی:

— مامە بۆ.. وا دەکەیت؟.

— جا چیبوو.. وام کرد لە جیاتی کچی خۆمم پێشکەش دەکەم.

عەلی یەکسەر گوتی:

— بەخوا بێزم نایەت کێری خۆم لە قوزی کچی تۆ پیس بکەم.

## پیتی — پ —

### ١-پلەی حەرارەت گرتن:

لەسەرەتای حەفتاکانی سەدەی رابـردوودا مـن لای نـەخۆش بـوو لـە نەخۆشخانەی ((کۆماری)) لەشاری بەغدادا. کوڕە عـەرەبێکی دەشـتەکی لە دەوری شازدە، حەڤدە سالّیدا دەبوو.. وەك ((مـانگـا)) قـۆڕەی دەهـاتو دەمی بەهیچ شێوەیەك وێك نەدەهاتەوە. پلەی "حەرارەت"یان لە قوونیـەوە گرت.

تومەز کوڕە شاپلیتێکی ئـاگر لەسـەر شـادەماری خوێنبـەری لاقـی دادەنێت و خوێنی سووتاو بۆ نێو دلّی دەچێت، ئـەوهای لێکردبـوو. نـازانم پاش من چاك بووەوە، یاخۆ مرد.

### ٢-پەنجەی تێدا ختم کردبوو:

پیاوێـك لەهـەلّس‌و کـەوتی ژیانیـدا، لەچـاو کەسـانی دەوروبـەری لەیـەغباری خـۆی نـاڕازی بـوو..و شـەوو ڕۆژ لـەیادی نەپـەڕی‌و هـەردەم دەیگوت:

— لە زێدە ئەو عالەموللایە تەنیا هەر من بـێ هیرو بەختم.

شەوێك خەون دەبینێت: خەڵكێكی یەكجار.. زۆر.. ڕاوەستاون‌و ئاسمانیان زۆر لێ نزیكەو دەستیان دەگاتێ و لە ئاست سەری هەریەكەیان شەبەقێكی گەورەی تێبووەو سەیری دەكەن. تەنیا ئاسمانی ئاست سەری ئەونەبێت كونێكی زۆر گچكەی تێدایە.

پرسیار دەكات‌و دەڵێت:

— ئەو كونانە چنە؟.

ئەوانیش دەڵێن:

— كونی یەغبارو شانسەو هی هەمووان وەك یەك گەورەنە تەنیا هی تۆ گچكەیە.

ئەویش ئەوسا پەنجەی بەهەموو هێزییەوە لە كونەكەی خۆی ڕادەكات، بەڵكی قیچێك فراوان ببێت. كاتێك لە شروی ژانی كونە قوونی وەئاگادێت‌و پەنجەی خۆی تێدا ختم كردبوو.

**٣-پەنجەیەكی تێڕادەكات:**

پیاوێك لە گوندێك لە گوندەكانی ناوچەی ((كەندێناوە)) هەر كیژی دەبوو.. كوڕی نەدەبوو.. هەر جارێ كە كچێكی دەبوو دەیگوت:

— بۆ مەلائیكەتی دروستكەری منداڵ زەحمەتە كێرو دووگونی لۆ دروست بكات یەكسەر پەنجەیەكی تێڕادەكات‌و دەیكاتە كیژ.

**٤-پەیكەرەو بۆ ماڵەوەم كڕیوە:**

پیاوێك دەستی لەگەڵ ژنێكی بەمێرد تێكەڵ دەكات. ڕۆژێك دەچێتە لای ژنەو مێردەكەی بەسەردا دێتەوە، كابرا دەڵێتە ژنەكەی:

— چم لێدەكەیت.

ژنه دەڵێت:

— هەستەوەو پشت بەدیوار بدەو هەر دوو دەستت ڕاگرەو جوولەی مەکە.

ئەویش ناچار بەگوێی دەکات.

هەر کە مێردەکە دێتە ژوورەوە بە ژنەکەی دەڵێت:

— ئەوە چییە؟.

— ئەوە پەیکەرەو بۆ ماڵەوەم کڕیوە.

مێردەش یەکسەر دەچێتە بەرداخە ئاوێکی بۆ دەبات و پێیدەڵێت:

— ها..ئاو بخۆوە من ((٢٤)) بیست و چوار سەعات لە ماڵی مام ساڵحی ئاوا ڕاوەستام قومە ئاوێکیان نەدامێ.

**٥-پیاسەی ئەوهامان:**

من و دایکی منداڵان ڕۆژێک بە ئێش چووینە بازاڕ. کوڕوکچێکی جاحێڵ لە پێشمان پیاسەیان دەکردو دەست لە نێو دەست بە ڕووی یەکتر دەتریقانەوە. منیش بە دایکی منداڵانم گوت:

— داخوا کوڕە بۆ فریودانی کیژە چەند درۆی دووزەردێنە هەڵدەڕێژێت.

بەسەر لەراندنەوە گوتی:

— گوتنی ناوێت.

پاشدان گوتی:

— پیاوێژگە کاتی خۆی من و تۆش پیاسەی ئەوهامان زۆر کردووە.

لە مەرامی حاڵیبووەو چاوی مژتم بە خۆمدا شۆڕ کردەوە.

٦-پیاو ئەو ڕۆژەی ژن دەهێنێت:

—ڕۆژێك لەکاتی نان خواردندا بەدایکی منداڵانم گوت:

—حورمیّ نیازم وایە ژن بێنم.

یەکسەر.. ڕاچڵەکی و دەستی لەسەر نان ڕەق بوو.و چاوی لە مۆڵەق و دەمی شلەژانی بەش بووەوەو بەجاوە جاو گوتی:

—بۆ.. پیاوەکە من چ عەیبم هەیە؟!.

—نەخێر بەڵام تەعام گۆڕینم پێخۆشە.

پاش هەوڵ و تەقەلاو نـاو ڕانەوەیـەکی زۆرو مـردو سـۆت دینـارێکی برێمری نەهێنا. لەتاوان دەلحاز هاواری بـۆ دەسـتە خوشـکێکی خـۆی لـە ئاوایی بوو برد.

چتۆ ئافرەت بوو. ئۆینبازو بە بلحاتی وەك خۆی نەبوو.و جۆی بـەدیوار هەڵدەگێڕاو دەیزانی پیاوانی ئاوایی چەند موویان بە لەشییەوەیە. هەرکـە دەگوترا. ((فاتە هەیتە)) دەبڕاوە. بەقسەکەی هەتا لەسەر پشت کەوت لە حریتەیداو جا گوتی:

—خوشکم لە ژیاندا ئەوەندە ساویلکەو عولعولی مەبەو پیاوان بناسە. مێردی تۆ ئۆمەرەو هەرگیز پیاوی دوژنان نییە.

بە ڕوویدا تەقییەوەو گوتی:

—شەکرت خوارد مێردی مـن ((خـدرە))و سوێندیشـی خـواردووە ژن بێنێت:

هەنئوب لە قاقایداو:

-نا..نا.. خوشکم ئەگەر خدر بووایە ئەو .. وەختەی دەهاتە سەرمارەبڕین پێیدە گوتی:

بەمە دڵی تۆزێك داکەوت. کەلەکەی تۆخەی کەوتە عەردیو هەرکە ئەمەشی لێ بیست:

-پیاوی تۆمەر، بۆ ئەوەی ژنەکەی لێی بترسێتو لەگوێڕ حەمدی دەرنەچێت ئەو ڕۆژەی ژن دەهێنێت هەتا مردن ئەو گووەی دەخوات.

**٧-پیاوی گوندی ئاغاو کوێخوایان:**

لە زەمانی زوو هەر پیاوێك ناو شانی کورتەکە کەی بدڕابووایە دەیانگوت:

-((ئەوە دانیشتووی گوندی ئاغانە)) .

هەر پیاوێکیش سەری هەنیشکی کورتەکە کەی بدڕابووایە دەیانگوت: ((نیشتەجێی گوندی کوێخوایانە)) .

یەکەمیان لەبەر ئەوە لە دیوەخان نەدەوێران پاڵ بداتەوەو پشتی بەدیواری دیوەخانەوەی دەقرمساند بۆیە زوو نێوشانی کورتەکی دەدڕا.

ئەویدی لەبەر ئەوە هەردەم پاڵیدەداوە هەنیشکی زوو دەدڕا.

**٨- پێڵاو دزەکە:**

لەیەك لە مزگەوتەکانی شار، لەکاتی دابەستنی نوێژی جومعە پێڵاوێکی زۆر دەدزرا.

خێر خوازێك پیاوێکی نوێژنەکەری بەکرێ گرت لەکاتی نوێژی هەینیدا ((سایەد))ی پێڵاوان بێت. کابرا هەرکە نوێژ دادەبەسترا دەچووەوە ماڵ. جارێك ژنەکەی پێیگوت:

–تۆ حەرەسی پێڵاوانیت دەبـــێ هــەتا خەڵکەکــە لــە نوێـژ دەبنــەوە مزگەوت بەجێ نەهێڵیت.

ئەویش بەزەردەخەنەوە گوتی:

–حورمێ پێڵاو دزەکە خۆمم.

## پیتی - ت -

### ١-تا تووشی مایەسیری نەم:

چوار کەسی خەڵکی شاری هەولێر ((لەبەر ئەوە لـە ژیانـدا نـەماون ناتوانم ناویان بهێنم)) بۆ چارەسـەرکردنی ((مایەسـیری)) دەچـنە شـاری ((دیالـە)). ئەوسـا ژنێکـی عـەرەب عەمـەلیاتی مایەسـیری دەکـرد. یەکێکیان تۆزێك لە عەمەلیاتەکە دەترسـێت‌و لـە دڵـەوە بڕیـار دەدات‌و دەڵێت: ((

—واچاکە ئەمن نەیکەم. پاشە ڕۆژ ئەگەر ئەوانە چاك بوونـەوە ئەوسـا دەیکەم)) .

هەریەکەیان بەتەنیا لەگەڵ ژنـە دەچـتە ژووری عەمـەلیات. کـابرای چوارەم لە ژوورەوە بە ژنەکەی دەڵێت:

—من مایەسیریم نییەو لەگەڵ ئەوانە هاتوومە. بەس پێم خۆشە لەبەر دڵی ئەوان، تاکو بزانن: منیش عەمـەلیات کـراوم لای جـەنابت بەقـەدەر ماوەی عەمەلیاتەکە بمێنیمەوە.

دوای ماوەکە کابرا وەك ئـەوان، بەلاکـەلاك دێتـە دەرەوە. لـە ڕێگـای هاتنەوەیاندا ئەوەی عەمەلیاتی نەکردبوو هەرکە هاوڕێکانی دەدیتن لەتاو

ژانی قوونیان عەجمانیان نییەو خۆیان بەملاو ئەولای کوشینی ئۆتۆمبێلەکە دادەدەن لە تریقەی پێکەنین دەدات.

هاورێکانی ئەوسا دەحسێن‌و پێیدەڵێن:

—دیارە تۆ عەمەلیاتت نەکردووە!؟.

بۆ ئەوەی لە کۆڵی ببنەوە دەڵێت:

—خۆ من وەك ئێوەبێ عەقڵ نیمە: کاتی خۆی تاکو توورشی مایەسیری نەبم بە مندالّی قوونم داوە.

۲-تەبەقە ترانە:

پیاوێك بە خێزانەوە دەچێتە مالّی مەلای ئاوایی منداڵێکی میوانەکە، بایەکی دەنگداری لێبەردەبێت‌و باوکە بەمەلای دەڵێت:

—مامۆستا تەبەقە ترانەتان کەوتەسەر.

مەلاش یەکسەر دەڵێت:

—برا ئەنگۆ خراپ لەتەبەقە ترانە گەیشتوون.

میوانەکە دەڵێت:

—چۆن؟.

—ئەگەر ئێمە تەبەقە ترانەکەتان بدەینێ ئەنگۆ بێگومان لەمەودوا فێر دەبن‌و.. وازی لێناهێنن. بەلاّم ئەگەر ئێوە بیدەن ئەوسا قوونتان دەزوورێتەوەو زەرەریشتان لێ بکەوێت جارێکی دی نایکەنەوە.

۳-تەسکان:

پیاوێك کۆلاّن بە کۆلاّن دەگەڕاو بە دەنگی بەرزەوە دەیگوت:

—تەسکان بەرین دەکەم. تەسکان بەرین دەکەم.

پیاوێکیش لێیچووه پێش‌و گوتی:

— ئەدی بەرینان تەسك ناکەیتەوە؟.

بەسەر بادانی نارەزایی یەوە گوتی:

— ئەگەر بەرینم پـێ تەسـك بکرابووایـەوە. نیشـی سـاڵێکی رەبـەقم لەماڵی خۆم دەبوو.

**٤-تەڵاقم نەدەدا:**

کابرایەك ژنەکەی زۆر جوان‌و کۆك دەبێت، بەڵام رەوشتی تەواو نابێت..

مامەی کابرا پێیدەڵێت:

— رۆڵە ژنەکەت بـێ ئەخلاقەو سومعەت پێدەچێت‌و دەبـێ تـەڵاقی بدەیت.

کابرا ناچار تەڵاقی دەدات.

مامەکەی ژنی بۆ دەهێنێت‌و پێیدەڵێت:

— ئەوە باشتر نییە لە ئەوی پێشترت.

ژنی دوایی ناشرین دەبێت و.و وەڵامی مامی بەم تەرزە دەداتەوە:

— مامە ئەگەر نیوەی ئاوایی بیگابووایە من لەبەر تۆ نەبووایە تـەڵاقم نەدەدا.

**٥-تەڵەو رێویانێ:**

((ئەم یارییەم تەنیا لە گەنجان دیوە، نەك لە منداڵان)). یەکێك هـەر دووپێی بەیەکەوە دەبەسترێن‌و هەردوو دەستیشی بەیەکـەوە. ئەمـە تەڵـەی ناوە. تەڵەکە هەڵدەستەسەر هەرچوار پەلی . کەسێکی دی خـۆی دەکاتـە رێـوی‌و دەسـت‌و پێـی راسـتەی ((بـابلێین)) دەخاتـە بۆشـایی نێـوان

هەردوولاقی تەڵەکەو دەستو پێی چەپیشی داوێتە نێوان بۆشایی هەردوو دەستی. ئەوسا سەری نەوی دەکاتو دەیخاتە بن زگی تەڵەکەوەو خۆی بەلای پشتەوە وەر دەگێرێت. تەنگەی تەڵەکەو پشتی ڕێوییەکە دەکەونە عەردیو پاشەڵی ڕێوییەکە بەفشی بەرز دەبێتەوە. هەتا تەڵەکە دەستو پێی خۆی شل نەکرد بووایە ڕێوییەکە هەرگیز نەیدەتوانی خۆی بەئاستەمیش بجووڵێنێت.

من لە دیارنەبووم، بەڵام لە دیوەخانی گوندەکەمان کوڕی ئاغا وایکرد کوڕە کرمانجێکی تۆزێك ناحەز ببێتە ڕێوی. دووسێ کوڕی گەنجی دیکە بەفیتی کوڕی ئاغاوە دۆخینی شەرواڵی ڕێوییەکە دەکەنەوەو بەڕێککەوتیش مووی بەری درێژ دەبێت و داو داوی دەردەکێشنو کوڕە زیڕەی دەگەیشتە کەشکەلانی حەواوە. نیازیش لەم گەمەیە ڕیسواکردنی ڕێوییەکە بوو.. و بەس.

**٦-تەماعی مەلا:**

سێ کەس لەسەر ڕووبارێك دانیشتبوون، یەکێکیان مەلا بوو. سێ ((٣)) فەردە شت بە ڕووبارەکەدا هات. هەر کە دیتیان هەرسێکیان خۆیان فجوڕکردە نێو ڕووبارەکەوە. مەلایەکە دووفەردەی گرتەوە. دووانەکەی تریش فەردەیەك. هێشتا لە ڕووبارەکە دەرنەهاتبوون مەلا بەدەنگی بەرزەوە گوتی:

—من لەفەردەکەی ئێوەش بەشم هەیە.

**٧-تەنەگەی سەراولێــژ:**

چەند گەنجێك یەك دووساڵ بوو ژنیان هێنابوو گشتیان لەسەر ئــەم ڕاو بۆچوونە كۆك بوون:

—ژن هێنان تەنەكە پیسایی یەكەو سەرەكەی چوار پەنجە هەنگوێنە.

یەكێكیان لە حریتەی پێكەنین دەدات.

پێیانگوت:

—بە چ پێدەكەنیت.

— گوتی:

—هەركە من ژنم هێنا تەنەگەكەم سەراو لێژ داندرابوو.

**٨- تەیارەخانە:**

پێشكەشە بەتەیارەكەی كاك عەلی خانەقینی.

لەنێو پاس دانیشــتبووم‌و دوور لــە خــەیاڵی مــام شەهابــی دنیــادا. لەهێكەوە كیژێكی قشت‌و جوان‌و ناسك و تەڕوبڕ، تــازە دەهــات هــەلبێت بەرامبەرم قنج دانیشت: بارستانی مەمكەكانی لەبن كراسە شینە تەنكــە گــوڵ گوڵیەكەیــدا ، لــەدوور.ڕا ســەرە دیقانێیــان بــوو. حــەزی دڵــی مردووانیشی بەســەما دەخســت. تەیارەیــەكی زێــڕ، بــە زنجیرێكــی باریــك بەگەردەنی شۆڕ ببودوەو گەیشتبووە دۆڵی نێوان مەمانی‌و نۆبات لــەكاتی لەرینەوەی پاسەكەدا، بەملاو ئەولای ئەو تیشە سپییە، ســەرنج كێشــانەی كە بەدەرەوە بوون دەكەوت.

ئەگەرچی عەمرم بارتەقای حەفتاو قســوور ســاڵی كردبــوو.و دەســتم بــێ خوایشتی‌و ویستم لەپەتی حەزحەزۆكی بەربوو بوو.و لــەنێو كیــژۆڵان

حەیامێك بوو ((خاڵە))بووم، بەڵان ڕاستە دەڵێن: ((دڵ هەرگیزاو هەرگیز پیر نابێت))و هێشتا تەڕاتی تێداما بوو.و ماڵوێران نەبووە دەڵحاز لەبنەوە لۆی بزواو عەجمانی لێهەڵگیراو کوتە کوتی لەسەر سەرتو چلو.. بەچاوی موشتاقو سوقەوە کەوتمە دەریای تێڕامانو ئاگام لە دانیشتووانی ئەملاو ئەولای خۆم بڕا، بەس هەستم کرد لیکاوی خۆشی لەزارمەوە بازرەقەی بەستا.

کیژە هەر کەدیتی دەمێك — دووان هەر لە دیقەتدانەدا بەردەوامم حسیاومە کتەبلیش بوو.. شەرمو مەرمی، لەهەڵسوکەوتی ژیانمدا توورِ درابوو..بۆ ئەوەی لە ئاست خەڵکی نێو پاسەکەدا ڕیسوابم، پەردەی تەریقیەوەی جیڕ بەجێڕ کرد.و بەڕوویەکی گەشو عوبابی کەمێك نەڵخەوە، لەگەڵ ڕاگرتنی تەیارەکە بۆم، قەشمەر ئاسا گوتی:

—خاڵە..ها.زەریف تەماشای بکە. تەیارەیە، تەیارە.ئ..ە لێشت ناگرم کرمانجیتو چشتی ئەوهات بەعەمری خۆت نەدیتووە، بۆیێ وابێ نابڕووانە، بەچاوی زەقی مەراقەوە تەماشای دەکەیت.

گەرچی گوتەکەی بۆمنی ڕیش چەرموو، لەنێو عەشاماتەکەوە جێی خەجاڵەتو شەرمەزاریو بەسەرخۆدا شکانەوەبوو، بەلانەکێ گڕی حەزی دڵم ماخۆ مردە هۆشی چوواندبووم و دەلینگی بێ چاوو ڕوویی پێ هەڵماڵی بوومو گەڕاندبوومیەوە هەڕەتی مۆزە مۆزی تڕۆ یاتییەکی وا هەرگیز هەست بەحەیاچوون نەکەمو دەس ەجێ، بەبێ پەروەردەوە گوتم:

—خاڵە کرمانجت دەبەرێ مرێت، مر لە ژیاندا ئەوەندە خەشیمو عولعولی نیمەو تەماشای تەیارەکەشم نەکر.ووە هۆباب!.

بەحەیرمانەوە، ویستی زار هەڵێنێتەوە و درۆم بداتەپاڵ کەچی من کەلێنم نەدایەو گوتم:

— کیژە جوان لێم مەگرەو عەیب نەبێت ((تەیارە خانەکە)) تاگری تێبەرداوم تەیارەخانەکە.

بەم گوتەیەم سەری بلەز شۆڕکردەوەو شەرمە ترِانە ((گۆ))و سوورانی مەمکە تورتەکانی، بەداخستنەوەی دوگمە ترازاوەکەی کراسی داپۆشتەوە.

۹-ترسنۆك:

ڕۆژێك بەسەفەر چوومە شاری ((کۆیە)). لە گازینۆیەکدا ڕوونیشتم.

دوو کوڕی گەنج یەکێکیان موسڵمان، ئەویدی مەسیحی سوحبەتیان بەیەکەوە دەکرد.

موسڵمانەکە ڕووی لە دیانەکە کردو گوتی:

— دیانی ترسنۆك.

هەردووکیان منیان دەناسیو دیانەکە ڕووی تێکردمو گوتی:

— مامۆستا عەزیز بزانە ئێمە ترسنۆکین، یاخۆ ئەوان؟.

گوتم:

— فەرموو.

گوتی:

— هەر کە عەرەب بەناوی ئیسلامەوە هاتنو شیریان هەڵکێشا، بەرەبابی ئەوە لە ترسانا هەر زوو ((شادەیان)) هێنا. ئێمەش نەمانهێنا.

منیش گوتم:

- بەبەختم ئەوان ترسنۆك بوونە.

**١٠-ترسی سەگە بۆر:**

ڕۆژێك شێرێك نێچیرێكی لە عەردیداو جەرگو ناوەكەی خواردو ئەویتری بەجێ هێشت.

پاش ئەو لاشەكە بووە مۆڵگای قەلو ڕێوی و گورگو چەقەڵو داڵاشان.

لەسەر خواردنی گۆشتەكەی پێك نەهاتن و هەر بابابوو سوێندێكی مزری پێدا دەداو دەیگوت:

- وەللا وەبیللا وەتاللا دەسكوژی خۆمەو نایدەم بەكەس.

ئیتر بووە شەڕو شۆڕو لێكدانێك ئەوسەری دیار نەبێت.

ئەوان لەو هەللاو زەنایەدا بوون لە ناكاو سەگێكی بۆری ملەوەزو گوێپەڕەی ملی كۆپەلاَنی، لەلاڕاپەیدا بوو.. و هەریەكەیانی بەلایەكدا هەڵبڕی و ئەوجا چووە گژ تەرمەكە.

ئەوانیش دووراو دوور، بەكوسكە كوسكی چاوی سوقەوە، دەیانڕوانی چۆن واگۆشتەكەی لرف دەكات. دوای هەنگرانی، لە هێسكو پێستەو ڕیخۆڵەو .ورگەتژی سەخۆر زیاتری نەهێشتو چەند هەنگاوێك دووركەوتەوەو بە وەركەوتن لاتە عەردێكی گرت.

ئەوانیش بەماتە ماتو بێ چرپەو خشە بۆلای تەرمەكە خشینو بە پەرۆشەوە بەربوونە خواردنی پاشماوەكە.

ڕێویەكە چرپاندوویە بەرگوێیانو گوتی:

- لێگەڕێ با ئاوامان لێ بێت. لەبەر مخەنەتی خۆمان لە سەر خواردنی گۆشتە ناسكو تەڕو برەكەی پێك نەهاتین كەچی هەنووكە ترسی

سەگە بۆری لە گۆڕێیە، لەسەر خواردنی پێستەو ڕیخەڵۆكو سەخوڕەکەی دەڵێت: برای دایكو باوكین.

..........................................................

تێبینی: ئەمەم لە زەمانی حکومەت بلاوکردەوە. خوالێخۆشبوو شێخ ستار حسیا خۆی دەگرتەوە گوتبووی: ((

— هەرکەس ڕاسبێتەوەو چیۆکی منداڵان بنووسێت بەرەو هەڵدێرمان دەبات)) .

منیش هەرکە ڕۆمانی ((گورگو بزن))م دەرچوو، وتەکەیم لەسەر نووسیو پێشکەشم کرد. هەر ئەوەندەی لەدەست هات بڵێت : منیش کتێبێك چاپ بکەم پێشکەشی دەکەم.

## ١٠-تڕکەن:

دوو برادەر لە نزیك ڕووبارێك دادەنیشنو ئافرەتێکیش لەسەر ڕووبارەکە خەریکی شمەك شوشتن دەبێت.

یەك لە دوو کەسەکە بەویدی دەڵێت:

— ئەگەر بچم ئەو ژنە ماچ بکەم چمدەدەیتێ؟.

ئەویش ژنەکەی دەناسیو لای محاڵ بوو.و گوتی:

— ئێوارە گیسکێکت بۆ دەکوژمەوە.

کابرا بۆلای ژنە دەچێتو داوای سابوونی لێدەکات دەستی پێ بشوات. لەکاتی دەست شوشتندا دەنگێکی لێوە دێتو ژنەش بە پێکەنینەوە دەڵێت:

— پیاوو تڕیان گوتووە.

کابرا لەترسی شەرەف چوون لە ژنەکە دەپاڕێتەوە سڕی هەڵنەماڵێتو لە ئەنجامی تکاو ڕجایەکی زۆر دەستو ڕومەتی ماچ دەکاتو ژنەش بەڵێن دەدات دەنگ نەکات.

برادەرەکەی دیتی ژنەکەی ماچ کرد ئێوارە بەڵێنەکەی خۆی بەجێ هێنا.

چەند ساڵی بەسەردا تێپەڕی ئێوارەیەك مێردی ژنەکە دەچێتەوە دەڵێت:

— ئەو ڕۆ لەگەڵ فلان بەشەڕ هاتم .

ژنەش پێیناخۆش دەبێتو دەڵێت:

— فلانی تڕکەن؟.

بەسەر سوڕمانەوە دەڵێت:

— کوو دەزانیت تڕکەنە!؟.

ئەویش واریقاتەکەی لەسیری هەتا پیازی بۆ دەگێڕێتەوە.

لەو ڕۆژەوە تڕکەنی بەدواکەوت.

## ١٢-تف لەتکە خۆر:

کابرایەك دەچێتە لای دختۆر بۆ ئەوەی لەکاری شەوان بە هێز ببێتو دەڵێت:

— دختۆر شەوانی پێشتر دوروسێیەکم پێدەکرا ، هەنورکە هەر چەند هەوڵدەدەم هەر یەکم پێدەکرێت.جا هاتورمە چارەیەکم بکەیت:

دختۆر دەڵێت:

— خواردنت بە زۆری چییە؟.

–ساوەرو بڕووش‌و گەنمە کوتایە.

دختۆر ئەوسا بێزی لـەخۆی دەبێتـەوە، هـەموو شـەوێی پێیناکرێـت، خواردنیشی بە زۆری تکە بووەو سەری بۆ عەورەتی شۆڕ دەکاتەوەو دەڵێت:

–تف..عەمرت نەمێنێ تکە خۆر.

## ١٣-تۆخوا مەلا:

مەلایەك دوو ژنی هەبوو. لە ترسی مەلا ژنی گەورە نەیدەوێرا بچێتە کن ژنە گچکە. رۆژێك مەلا ژنی گەورە لەماڵ نابێت و مەلا بە دەرفـەتی دەزانێت‌و دەچێتە کۆ مـەلاژنی گچـکە. هێشـتا بـە ئاکـامی دڵـی خـۆی نەگەیشتبوو مەلا ژنی گەورە بەسەردا دێتەوە. مەلا ناچار بەپەلە دەچێتە سەر دووگوردی نوێژو بەرەو قیبلە چۆك دەداتەوەو دەڵێت:

–التحیات‌و المبارکاتُ.........

مەلاژن یەکسەر دەچێت لچـکە کـەوای هەڵدەداتـەوە دەبینێـت مـەلا چشتەکەی قیتەو دەڵێت:

–تۆخوا مەلا ئەوە کێری ئەلتەحییات خوێندنێیە.

## ١٤- تۆبەکەم دەشکێت:

پیاوێك لە دێهاتدا دوو گوێدرێژی هەبوو جووتی پێدەکردن‌و گوزەرانی خێزانەکەی پێوەبەڕێوە دەچوو .

رۆژێك جوتیار لەسەردەستی شێخێك تۆبەی وەرگـرت‌و بـۆ بەسـۆفی‌و- وازی لە جووت هێنا.

ژنەکەی پێیگوت:

–پیاوەکە بۆ ناچیتە جووت؟.

– حورمێ ئەگەر بچمە جووت پاشەڵی ماکەرەکەمان دەکەوێتە بەرامبەرمو ئەویش حەرامەو تۆبەکەم پێدەشکێت.

## پیتی - ج -

**١-جارێ ئەوەی گەورە بکە:**

پیاوێك بووکێکی گێلو شێتۆکەی دەبێت:

رۆژێك بووکەکە ترێکی گەورە دەکات. بۆئەوەی بەسەر خۆیدا نەشکێتەوە خەزووری بە بافرەیەکەوە پێیدەڵێت:

—کیژم ئەوە نیشانەی ئەوەیە نۆبەرەکەت کوڕ دەبێت.

بووکەکە زۆری کەیف پێدێت و دەڵێت:

—مامە یەکێکی دیکەش بکەم؟.

—نا..نا.. رۆڵە جارێ ئەوەی گەورە بکە بۆ یەکێکی دی خەمێکی دیکەی دەوێت.

**٢-جبۆ هێواش:**

کابرایەکی کەمفامو زۆر بەدین شەوان تا بەیانی تەنیا لە مزگەوت بەخوا پەرستی بەسەردەبرد. کابرایەکی مەفتوورقی ئاوایی لە شەوێکی ئەنگوستە چاودا دەچێتە سەربانی مزگەفتەکەو لە کونی ((دوکەڵکیش))ەوە بە دەنگی بەرزەوە دەڵێت:

– فلان من جوبرائیلم خوای تەبارەك وەتەعالا، بۆ ئەوەی ناردوومە تاکو لە تۆڵەی خۆت، لەژیانی دنیای هیچو پووچدا زۆر بەعیبادەتی من هیلاكو ماندوو کردووە، جەنابت بۆ ئاسمان هەڵبکێشم. ئەوا کندرم شۆڕکردەوە توند توند لە تەنگەی خۆت ببەستە.

– کابرا لە خۆشیان شاگەشکە دەبێتو بەگوڕی موشتاقەوە کندرەکەی بە دووسێ گرێوە لەقەدی خۆی شەتەکدەدات.

کابرا هەڵیدەکێشێت. هەرکەسەری بەساپیتەی مزگەوت دەکەوێت تۆزێکی دەیە شێتو دەڵێت:

– هێواش حەزرەتی جوبرائیل.

هەر کە پتری دێشێت، دەڵێت:

– هێواش جوبرائیل:

جارێ سێیەم زۆری دێشێتو دەڵێت:

– هێواش جبۆ، هێواش جبۆ.

ئەوجا لەسەر .. ڕابەریدەداتەوە.

.....................................

ئەمەم بە منداڵی لەناو فەقێیان بیستووە.

### ٣-جیەجیەی قەڵەم:

پیرەژنێك لەدارەتی دنیادا یەك تاقە کوڕی دەبێت: ئەویش فەقێ بووە.. و لەناو فەقێیانی دەخوێند. جارێك زۆر درەنگو لە وەرزی زستانیکی

تووش دەچێتەوە. دایکەکە ئێوەرە خواردنێکی باشی بۆ درووست دەکات‌و شەویش پێخەفێکی گەرمی پێدا دەدات.

فەقێی هیلاك‌و سەرمابردە هەر کە تێر بوو .و گەرمیش بوووەوە ناوە ناوە دەنگێکی گەورەی لێوە دەهات. دایکەکە بەهەر ترێك گوراح خۆش دەبوو.و بە پێکەنینەوە دەیگوت:

—ئەی لەبەر جێی جێی قەڵەمت مرم ڕۆڵەی فەقێ لە کاتی نووستنیشدا ، داکەسانی نییەو هەر جێی قەڵەمی دێت.

## ٤-جێم کەن جێم کەن:

لە ڕۆژی قیامەتدا، کاتی تێك قژ قژانی خەڵکە هەزارە زیلە کەوە چاوەڕووانی حەق‌و حەسێبدا یەکێك تەنگەتاو دێت‌و بەدەنگی بەرزەوە دەڵێت:

—جێم کەن، جێم کەن من شەهیدی ((کەپکی حەمەد ئاغا))مە.

یەکێك بە ڕوویدا دەتەقتەوەو:

—سەبر بگرە هۆباب سەبر بگرە من شەهیدی بەدرم هێشتا نەچوومەتە بەهەشت، ئەوجا نۆرەی جەنابتە.

## ٥-جێی کاکت کە:

کابرایەکی دەشتی هەولێر دەچێتە گوندێکی خۆشناوەتی. خانە خوێیەکە جێگەی لەسەربان بۆ ڕادەیەخێت. میوان شەو شەیتانی دەبێت. هەڵدەستێت بچێتە کانی خۆی بسمیل بکات. شارەزانەبوو لە ئاوایی دەگەڕێت‌و تووشی کانییەك دەبێت‌و دەچێتە ناوی‌و هێشتا وسلی تەواو

لەخۆی دەرنەکردبوو لە ناکاو ژنێـک پەیـدا بـوو.. و خـۆی ڕووت کـردەوەو لەگەڵ خۆ بە ئاو داداندا دەڵێت:

—جێی خوشکت کە ئەو شەو دووانی کردووە.

ئەویش لەگەڵ شەپ هێنانی لە ئاوەکەدا دەڵێت:

—جێی کاکت کە ئەوشۆ چواری کردووە.

ژنەکە لەرزووکە دەدات.

بۆ بەیانی دەزاندرێت! کابرای میوان بە هەڵە چووەتە کانی ژنان.

## پیتی - چ -

**١-چاوەش:**

لە زەمانی زوو هەرکە وەرزی دروونەی دەغڵدادەهات چاوەشی دزستی ئاغای گوندەکان پەیدا دەبوو.و دەچووە سەر پەریزان قرشە خڕبکاتەوە، زۆربەی هەرە زۆری جوتیارەکان، لەترسی زمانی پیسی چاوەشەکە نائومێدیان ڕەوان نەدەکردەوە. ساڵێکی نەهات چاوەشێك دەچێتە سەر پەریزی جوتیارێکی یەك لە گوندەکانی دەشتی هەولێر. جوتیارەکە پێیدەڵێت:

—کاکە لۆ خۆم نییە لۆ تووی لەکێ بێنم.

هەر ئەو رۆژە چاوەشەکە ئەو بوختانەی هەڵبەستا:

—هەرکە لە پەریزیان نزیك کەوتمەوە ئاگایان لەمن نەبوو هەوەڵجار دیتم: بابە سواری کوڕە بوو، لە دواییدا کوڕەش سواری بابە بوو.

ئاغاش پێی شین بووەوە.

.....................................

ئەمەم بەخۆم لە چاوەشێکم بیستووە. ئاوهێنان هەموار نییە.

**٢-چاوەکەی تریشتم دەردەهێنا:**

خوالیخۆشبوو مام ((سەعیدی شەریفە قیت)) جوامێرێکی مەندو لەسەرخۆ.و تێگەیشتووی ئاوایی بوو. لەکاتی درونەکردندا قڵچخێك دەپەڕێتە چاوی‌و کوێری دەکات. وێرای ئەوەش بیست‌و چوار سەعات ژان بەری نەدەدا. لەئاخرو ئۆخری چلەکانی سەدەی رابردوودا دکتۆری چاو کەم بوو. ناچار چووە بەغداو بەدەرهێنانی چاوەکەی ژانەکەی دەبڕێت.

هەرکە هاتەوە خەڵك بۆ کەفارەت لێکردنی چوونەکنی، دەڵێت:

—چاوەکەیان بەدوازدە دینار بۆدەرخێنام.

ئەوپارەیەش ئەوسا گەلێك زۆر بوو.

مەلای ڕەش پێیدەڵێت:

—برام ((١٢)) دوازدە دینارەکەت بدا بووایە من چاوەکەی تریشتم بۆ دەردەهێنایت.

**٣-چاوم:**

مەلا موعەلیمێکی برادەر ((ناوهێنانی هەموار نییە)) چاوی زەعیف دەبێت و پزیشکی تایبەت چاویلکەی بۆ دروست دەکات.

هەرکە دەچێتە دەوام، چەند مامۆستایەکی ئافرەت سەیری دەکەن‌و چاویلکەکەی زۆر ناشیرینەو قەشمەریانە پێی پێدەکەنن. ئەویش بەسەر خۆیدادشکێنەوە بەڵام دەسەڵاتی هیچی نایێت.

یەکێکیان دوای تریقانێکی زۆرەوە پێیدەڵێت:

—مامۆستا چماچاوت نەقوستانە؟.

ئەویش لەتۆڵەدا بە پێکەنینەوە دەڵێت:

— بەڵێ چاوم لە ((قوز))تانە.

**٤-چەکە خالآتە:**

وادەبوو پیاوێك کیژی خۆی بەماڵ = ((شیربایی)) دەدا، لەکاتی بووك بەرێ کردندا خاڵی کچە ڕازی نەدەبوو.. بیبەن. هەتا ماڵی زاوا هێندە پارەیان دەدانێ، ئەوجا ڕازی دەبوو، یان لەکاتی مارەکردن وەری دەگرت. من بە چاو نەمدیوە، بەڵام بیستوومە هەندە جار خاڵ شەشاگری لەجیاتی پارە وەرگرتووە.

ئەمە چەکە خالآنەی پێدەگوترا.

**٥-چزەکەت نامێنێت:**

دایكو کچێك بەیەکەوە لەسەردەستاو دەبن.

کیژە بە دایکی گوت:

— دایە ئەوە بۆ میزی تۆ هوشت دێت هی من چزە.

ئەویش دەڵێت:

— ڕۆڵە ئەوەی بەمن کەوتووە، بەتۆش بکەوێت چزەکەت نامێنێت.

**٦-چمان لە جوانیدایە:**

کچێکی گێلو شێتۆکەو نەزان زۆر دەوڵەمەند دەبێت. ڕۆژێك کیژو نافرەتانی دەوروبەری پێیدەڵێن:

— بۆ مێرد ناکەیت؟.

ئەویش لەبەر گێلیو کەمفامییەوە نەیدەزانی مێردکردن چییە. وادەکەن مێرد بەکابرایەکی زۆرزانو مەفتووق بکات. شەو بەنەنقەست لاقەی ناکات. بۆ بەیانی نافرەتەکان دەچنەلایو دەڵێن:

— خۆشبوو..؟.

— ناوەللا چ خۆش نەبوو.

زانیان لاقەی نەکراوەو پێیدەڵێن:

— هاتەلات چی کرد؟.

— هاتەلام هەتا بەیانی نووست.

پێیدەڵێن:

— ئەوشەو بە مێردەکەت بڵێ: ((

— دەبێ گەمەم بە دار ((ڕبە)) کەت لەگەڵ بکەیت خۆشە)).

بۆ شەوی دوایی دەڵێت:

— گەمەم بەدار.. ڕبەکەت لەگەڵ بکە خۆشە.

یەکسەر دەست بەگریان دەکات.

— ئەوە لۆ دەگرییت!؟.

— دار.ڕبە، بەپارە دەکرێت و منیش فلووسێك شك نابەم.

کچە هەندەك پارەی لە چنگ دەنێت:

-هەنووکە برۆ .. بیکڕە.

کابراش پاش پارە وەرگرتن دەچـێتە دەرەوەو دوای دەمێـك خـۆ بـواردن دەگەڕێتەوەو دەڵێت:

— کڕیم.

سێ چوارجار لەگەڵی جووت دەبێت و ژنە زۆری پێ خۆش دەبێت و ناوە ناوە دەستی پێدا دەهێنێت و دەڵێت:

— ئەو درێژە دار.. ڕەبەکەیە ئەدی ئەوانەی بنەوە چنە؟.

— گوڵێنگی دار.. ڕەبەکەنە.

— بۆ چ باشن؟.

— بۆ.. جوانییەو بەس.

ئافرەتەکە ئاخێکی گەورە لەبن زگییەوە هەڵدەکێشێت و دەڵێت:

— ئەمەی فەقیر چیمان لە جوانیدایە: بریا پارەی گوڵێنگەکانیش لە درێژی دار.ڕەبەکەت خەرج بکردبووایە!.

**٧-چوونە عومرە:**

دوو ژنی شاری هەولێر دەچنە عومرەو لە دەوری ((کەعبە))ی پیرۆز دەسووڕێنەوەو یەکێکیان هەر ئەو دووعایەی دەکرد: ((

— تەریك، تەریك، تەریك)).

تومەز ئەمەی لە پۆلیسەکان گوێ لێ ببوو.و وای خەملاندبوو کە دووعایە.

دووەم:—

لەکاتی تەوافی ((کەعبە))ی پیرۆزدا تەلەفۆنی لە هەولێرەوە بۆ کراو پێیانگوت:

— لە کوێندەریت؟.

گوتی:

— نازانم نەلەمەککەمە، نەلە مەدینە.

## پیتی - ح -

**١-حاجی ڕەمەزان :**

ڕۆژێــك پشــیلەیەك مێزەرێکــی لەســەر نــاو چــووە نــاو کۆنــە ((تەنــدوور))ێك هــەر چــواردەوری کونــە مشــك بــوو. مــا بەســەربادان زیکربکات.

مشکێك سەری بەتەندوورەکە دادەگرێتو پێیدەڵێت:

—ها.مام پشیلە ئەوە چدەکەیت لێرە؟.

ئەویش بەمەیلەو گریانەوە گوتی:

—تۆبەم کردووەو جارێکی تر هەتا ماوم مشکان نەخۆم. نــاوی خۆشــیم ناوە: حاجی ڕەمەزان. نەك پشیلە .

مشکەکەش خەبــەری شــای مشــکانی داو دەورەی تەندوورەکــە دەدەنو دەڵێن:

—حاجی ڕەمەزان ئەوە تۆبەت کردووە؟.

—بەڵێ. لەمەودوا ئێوە نەزەرتان حەرامەو مێنەبەرچاوم.

ئیتر مشکەکان لێکرا دەچنە ناو تەندورەکەو لەخۆشییان دەست بەشایی‌و هەڵپەڕین دەکەن. کاتێک شای مشکان گوێی لێبوو حاجی ڕەمەزان دەڵێت: ((

— دووان بگرە بەدەستی دووانیش بەپێ پەستی)).

شای مشکان ئەوسا دەڵێت:ـ

— یاللا کونان لێدەن تازووە ـ حاجی ڕەمەزان خووی هەر ئەوە خووە.

۲-حاڵم چێتر دەبوو:

لە عەرەبێکی ((بەدو))ی جل شڕو.وڕیان پرسی:

— یابە ئاواتت لەو دونیایە چییە؟.

ئەویش بەئاخەوە دەڵێت:

— ئەگەر دوو بزن دەبوو لۆشیر

— کێفێك دەبوو لۆگیر

— حاڵم چێتر دەبوو لە وەزیر.

۳-حەزرەتی عزرائیل بەقوربان:

پیرێژنێك لەدارەتی دنیایێدا یەك تاقە کوڕی دەبێت: کوڕە نەخۆش دەکەوێت و حاڵی زۆر.. شڕ دەبێت. پیرێژنی دایکیشی شەوو ڕۆژ هەردوو دەستی بە دووعاوە بەرەو حەوا بەرزدەکردەوەو بەناڵانەوەدەیگوت:

— خودایە من بکە قوربانی کوڕەکەم.

— خودایە مەرگم بەپێش مەرگی ئەو بکەوێت.

ڕۆژێك لەپاش خۆرئاوا بووندا دنیا شرەکە بور بوو.و پیرێژنیش هەر دەست بە دووعاو نزاوە لەبارەگای یەزدان دەپاڕایەوە، کتو خوا لەوساتەدا

چیلێکیان دەبێت لەحەوشە بۆ ئاو خواردنەوە سەر لە نێو مەنجەلێکی پڕ ئاو دەنێت. سەری لەناو مەنجەڵەکەدا عاسییە دەبێت و نایەتەدەرەوە.

مانگاکە بەرەو دەرگای ژووری ماڵەوە هەنگاو دەنێت. پیرێژن هەر کە دەیبینێت: ئەو شتە ڕەشە زەبەلاحەو سەری ڕەش‌و زۆر گەورەیەو دنیاش سامالەو ئاوی لێدێتە خوارەوە دەلحاز بەفرشتەی ڕووح کێش تێدەگات‌و دووعاو نزای لەترسان لەیاد نامێنێت و هەترەشی دەچێت‌و لەپاش تان‌و غیرەتدانە بەرخۆیەوە، بەنووزانەوە دەڵێت:

—حەزرەتی عزرائیل بەقوربان من نەخۆشەکە نیمە من نەخۆشەکە نیمە .

بەدەست ئاماژە بۆ کوڕەکەی دەکات‌و دەڵێت:

—قوربان ئەوە نەخۆشەکەیە، بەڵێ ئەوەنە خۆشەکەیە.

**٤-حەشەفە:**

زەمانی زوو لەو گوندانەی فەقێی لێ بوو بێت ژنێکی بەساڵاچوو خزمەتی دەکردن.

فەقێکان پێیاندەگوت: ((داپیرە)).

داپیرەیەك زۆر خزمەتی فەقێیانی کردبوو. ڕۆژێك فەقێیەك دەچێتە لای‌و پێیدەڵێت:

—داپیرە تۆ زۆر بەمەوە هیلاك و ماندوویت گەردەنمان ئازاد بکە.

ئەویش دەڵێت:

—ڕۆڵە سەت جار گەردەنتان ئازادبێت.

لەدواییدا دەڵێت:

– کەواتە لەباتی دوعایەکی خێرمان بۆ بکە.

ئەویش دەڵێت:

-ڕەبــی داپــیرە وەبــەر ((حەشــەفە))ی نێرەکــەری عــوزێر پێغەمبــەر بکەویت.

پیرێژن بەدوعایەکی باشی دەزانێت و بەوپەڕی سۆزەوە دەڵێت:

– ئا.میــ.ـن ڕۆڵە.. لەگەڵ دایکو بابی تۆش.

فەقێ لەدڵەوە دەڵێت: (( بەڕاســتی قــازانجم کــرد لــە جیــاتی دایکــم باوکیشمی گرتەوە)).

٥-حەفتا حۆری:

ڕۆژێك مەلایەك لەنێو کۆمەڵە موســڵمانێك وەعــز دەدات و لــەئاخرو ئۆخری قسەکانی دەڵێت:

– هەرکەسێك بە موسڵمانی بمرێت خوای تەبارەك وەتــەعاللا ((٧٠)) حەفتا حۆری پێشکەش دەکات.

کابرایەکی مەفتووق و سوحبەتچی لێراست دەبێتەوەو دەڵێت:

– مامۆستا مەعلووم حەفتا حۆریم دەدرێتێ؟.

مەلاش دەڵێت:

– بەڵێ.

– مەلا بۆ نابێت بگۆڕینەوە.

– گۆڕینەوەی چی..؟.

– من لەوســەری هەر حەفتا حۆرییەکانی خۆم دەدەمــە جــەنابت بــەس تۆ.. ئەمڕۆ مەلاژنم بدێ.

مەلا لە دەغەزان شێ‌و مۆر هەڵدەگەڕێت‌و بە هەڵچوون‌و دەنگی حیلەوە:

— سەی لە بابی سەجارێکی تر ئەو گووەی نەخۆیت!.

**٦-حەوت ژن هەڵاویردکەیەك:**

نزیکەی ((٦٠)) شەست ساڵ بەر لە ئێستا پیاوێکی زۆر بە تەبیعات‌و کەشخەم دیت تەمەن دایهێنابووەوە . من ئەوساوای بۆ چووم لەکاتی گەنجێتیدا بەینی لەگەڵ ژنان زۆر کۆك بوو بێت.

بۆ دڵنیایی پێم گوت:

— خاڵە.. لە ژیاندا چەند ژنت هێناوە؟.

بەزەردەخەنەوە گوتی:

— حەفت ژن‌و هەڵاویردتکەیەك.

بەحەیرمانەوە گوتم:

— لەهەڵاویردتکەکەت ناگەم.

گوتی:

— ژنێك بوو بەمارەو تەڵاق هەڵمگرت‌و چەند ڕۆژێکم لەلابوو. پاشدان دامەوە خاوەنەکەی.

**٧-حوشترێکی زەمانی عوسمانلی:**

حوشترێك لە نێو سوپای عوسمانی زۆر کاری پێکرابوو.. و چەندین چەك و تەقەمەنی پێ هەڵگیرابوو. ئەوەندەش پیر بوو بوو گۆشتەکەی نەدەخورا، تاکو بیکوژنەوە. بۆیە کاربەدەستانی عوسمانلی وایان بڕیاردا، لەپاداشتی خزمەتەکەیەوە بچێتە ناو ڕەزوباخ‌و بێستانی هەرکەسێك نابی

دەری بکات. رۆژێك دەچێتە نێوبێستانی پیرێژنێك ، لەترسی کاربەدەستان نەیدەوێرا دەری بکات. ناچار بۆ ئەوەی بڕەوتەوەو لە بێستانەکەی بەخوایشتی خۆیەوە بچێتە دەرەوە کراسی خۆی هەڵماڵیو بەشەپان وەردەگەڕێتە نێو گەلآنی خۆیەوە.

حوشترەکە ئاوڕی لێدەداتەوەو دەڵێت:

—پیرێژن من بەدەیان تۆپم لەسەر پشتم تەقێندرایتەوە نەرەویەوە، تازە بەتازە بەشەپەشەپی نێوگەلانی جەنابت دەرەومەوە.

**٨-حەیاتی حەمە شەریفی بوو:**

پیاوێکی شێت لە ئاوایی یەکدا زۆری هەوەست لەکەرگان دەبێت شەوێك دەچێتە ماڵی ((حەمە شەریف)) ناوێكو زۆری لێدەپاڕێتەوە ڕێگەی بدات بچێتە گژ ماکەرەکەیان. ئەویش ئیزنی دەدات.

هەرکە لەناو تەویلە دێتە دەرەوە خاوەن ماڵەکە پێیدەڵێت:

—ها.. کور بوو..؟.

ئەویش بە پێکەنینەوە دەڵێت:

—حەیاتی حەمە شەریفی بوو.

ئەمەش ئەمرۆ بووەتە قسەیەکی نەستەق.

## پیتی - خ -

**١-خەپە:**

خەپە پیاوێکی گێلۆکە بوو. بەوەج و تیکچەقی. لەشاری هەولێر دادەنیشت. دەچووە ماڵە ئاغاکانی دەشت. زبڵ و زاری نێو تەویلانیان بەکەم شتێك پێدەڕشت :

ڕۆژێك ئاغایەك زبڵێکی زۆری پێدەڕێژێت و ئەوجا بەمنداڵە وردکان لە ئاوایی دەریدەکات.

ئەویش لەبەر خۆیەوە هەر دەیگوت:

— ئێ..ئێ.. فلان ئاغا بالۆت بێنێت: زبڵیشت پێڕشتم و منداڵیشت تێبەردام.

**٢-خەریج زراعە:**

لە زراعە تەخەروجم کردو لە گوندێکی سەر سنوور، بە مامۆستا دامەزرام.

ئێوارە موختاری ئاوایی بردمیەوە ماڵەوە. تازە ژنی دووەمی گواستبووەوە.

شەو ڕاکشاو هاوارێك، بەدوای موختارەوە هات. من لەگەڵ خێزانەکەی مابنەوە. دوای ڕۆیشتنی موختار هێشتانەبۆرژابووم هەر هەندەم زانی نافرەتەکە گەنجێکی زۆر جوانو منداڵکار بوو هاتە ژێر پێخەفەکەمەوە.

تومەز بڕی تەواو بە موختاری ((٦٠))شەست ساڵە نەشکابوو. هەرچەندە هەوڵو تەقەلایداو دەستەودامێنم بوو، لەبەر باری نابینی بوو بێت، یان کۆمەڵایەتی بۆی نەچوومە ڕاێی. بەیانی هەرکە هەستامەوە دیتم ((٩)) نۆکەڵەشێرو مریشکێکیان لە حەوشەیە. بە حەیرمانەوە گوتم:

— حەکوو.. نۆ کەڵەباب بۆیەك مریشك!. لای ئێمە بە پێچەوانەیە.

ئافرەتەکە یەکسەر لە حریتەیەکی وایدا لە دوورەوە دەبیستڕا ئەوجا گوتی:

— ئەو کەڵەبابانە لەوانە نین کە تۆ دەیڵێیت.هەموویان خەریجی زراعەینە.

**٣-خدرو ئۆمەر:**

بایز قەراجیو مەردان قەلاتی دراوسێی ماڵ بەماڵ بوون لەشاری هەولێر جیرانەتیشیان زۆر.. ڕێكو پێك بوو.

لەهەمان گەڕەك، نزیك ماڵی هەردووکیان پەنادیوارێکی بەرزی تایبەت هەبوو، پیاوانی بێ ئیشی گەڕەك، دانی ئێواران لێیدادەنیشتن و کاتییان لێدەبردەسەر. بە ((گردی گەمبۆلان)) مەشهوور بوو. ڕۆژێك بایزو مەردان لە مەجلیسی گەرەکەکە دابووە دەمەقاڵیانو هەریەکەیان خۆی بە

((خدر)) حسێب دەکردو ئەویتریش ((ئۆمەر)). شتاقیشیان بۆ یەکتریان نەدەسەلماند. تاکو رۆژێك جەماعەتی گردەکە گوتیان:

— هەر هەنوکە تاقیتان دەکەینەوە، هەتا بزانین کیهانتان خدرە ئەویتر ئۆمەر. برۆنە ماڵەوە هەریەکەتان خێرا لەگەڵ خێزانی خۆی جووت بێت‌و بە دەست‌و برد چی بەسەر نەیەت بگەڕێتەوە ئەوە خدرە. ئەگەرنا ئۆمەرە. پاشدانیش بە ژنان وێدەکەوین جووت بوونە، یان..نا. ئەمەیان لەمەودوا بە ئۆمەری درۆزن لە قەڵەم دەدەین.

زۆری نەبرد پاش چوونەوەیان مەردان هاتە دەرەوەو نێوچەوانی خوێنی لێدەهاتە خوارەوەو گوتیان:

— دیارە دایکی منداڵان لێیداویت؟.

ئەویش لەگەڵ خوێن سڕینەوەدا گوتی:

— نەحەدو.. وار.

پاش ئەو بایز دەرهات هەرکەدیتی مەردان سەری شکاوە دووراو دوور، بەوپەڕی گوراح خۆشییەوە گوتی:

— نەمگوت: من خدرم‌و تۆش ئۆمەر!.

مەردان هەتا لەسەر پشت کەوت لە حریتەیداو جا گوتی:

— تۆ سەیری سەرو سەکوتی خۆت کردووە!. تا بەخدر حسێب بکرێیت.

ئەویش چی بە خۆی شك نەدەهات‌و دەستی بەڕووی خۆیدا هێناو گوتی:

— کا.. چم لێ هاتووە؟.

هەننۆب بە پێکەنینەوە گوتی:

عـُـر

— ئۆمەر ... سەروپۆتەلاّكت تەماشاكە .

هەركە سەيری كرد لەجياتی جەمەدانی ئاوەڵكراسی خێزانەكەی لەسەر ناوە.

**٤-خزمەكەی خودا:**

دووبرا هەبوون. يەكێكيان ئاقڵو ئەويتريان گێل.

گێلەكە نوێژی نەدەكردو عاقڵەش زۆر بەدين دەبێت. ديندارەكە بە واجبی سەرشانی خۆی دەزانیو هەموو رۆژێك بەبراكەی بڵێت:

— دەبیێ نوێژ بكەيت.

لەئەنجامدا وازی لێنەهێناو هەتا پێیدەسەلمێنێت و هەرزوو فێرە نوێژی دەكات.

رۆژێك لەنوێژی هەينيدا، برا عاقڵەكە لەديوی ژوورەوەی مزگەوت نوێژ دەكات و ئەويديش لە ديوی دەرەوە. بەس پەنجەرەيەكيان نێوان دەبێت. برای گێل لە شەهادە هێناندا ناوی پێغەمبەری ((د.خ)) لەبير دەكات. بەبراكەی دەڵێت:

— عەولا ،عەولا ئەرێ خزمەكەی خودا ناوی چییە؟.

**٥-خوات بەخولامی دايكت بكات:**

پياوێك دايكی رووی زۆر رەشو ناشيرينو لپرلپر دەبێت. رۆژێك دايك ناشيرين لەگەڵ مەلايەك دا دەكەوتە دەمەقاڵێيەكی توندو تيژ لەسەر ئەوەی دەڵيت:

— مامۆستا شەوە درۆيەو هەر.وجوودی نييە.

مەلاش دەڵێت:

— خوات بەخولامی دایکت بکات ئەگەرنا شەوە تۆی بردبوو.
کابرا بەمەراقەوە دەڵێت:
— چۆن؟.
— هەرکە شەوە چوو تۆ ببات چاوی بەدایکت .. کەوت وایزانی ((شەوە))یەکی دیکەیەو گوتی:
— ئەو شەوەیە هەر دەبیات من بۆ خۆمی پێوەی ماندوو بکەم.

**٦-خوا خوام بوو:**

کابرایەکی جوو.. نیشتەجێی یەك لە گوندەکانی دەشتی هەولێر دەبێت. تێکچەقیو بەخۆ.وە . رۆژێك بەرێدا دەڕوات. پیاوێکی کوردیش، لە گوندێکی دراوسێیدا دووراو دوور دەیبینێتو دەڵێتە خەڵکەکە:
— وا دەچم ئەو جووەی ئیسلام دەکەم.
هەرکە دەگاتە لای پێیدەڵێت:
— ئەگەر نەبیتە موسوڵمان دەتکوژم. جووەکە هەرزوو دەیگرێت ولە ژێرە خۆی دەنێتو ئەوەندەی لێدەدات هەتا شراری دەکات. داوای لێدەکات ببێتە جوو.
ئەویش دەڵێت:
— نابێ.
ئەوسا وازی لێدەهێنێت.
خەڵکەکە لێیدەپرسن:
— ها.. چیت لێکرد؟.
گوتی:

— کوڕه خواخوام بوو ئەمکاتە جوو.

**٧-خوار کردبووەوە:**

مەلایەك حەز لە ژنی کابرایەکی دراوسێی دەکات. نەیدەزانی چۆن لە ژنەکەی بەئاوات بگات. چەند رۆژ کەوتە دنیای تەکبیرو مشوور خواردن و لێکدانەوە. تاکو رۆژێك مەلا پیاوەکەی دەبینێت وا بەرەو قیبلە لەسەر ناوەو یەکسەر پێیدەڵێت:

— مادام بەرەو قیبلە دەستت بە ناوگەیاند تەلاقت کەوت.

بەم چەشنە ژنەکەی لەدەست رادەستێنێت و بۆخۆی مارەی دەکاتەوە.

کابراش لەو رۆژەوە سایەدی مەلا دەکات تاکو رۆژێك دەبینێت بەرەو قیبلە دەست بەئاو دەگەیەنێت و پێیدەڵێت:

— مەلا تۆش بەرەو قیبلە دانیشتوویت تەلاقت کەوت.

مەلا بە پێکەنینەوە دەڵێت:

— خۆمن وەك تۆ گەوج نیمە سەرەکەیم خوارد کردبووەوە.

**٨- خوایە تۆ:**

کابرایەك بە کێوێکی زۆر بەرز هەڵگەڕا . پێش ئەوەی بگاتە لوتکە هیلاك دەبێت و توانای رۆیشتنی نامێنێت و دادەنیشێت و روولە ئاسمان دەکات و دەڵێت:

— خودایە کەسێکم بۆ بنێرە سەرم بخات.

دەهات ماندوویی بسێتەوە، کاتێك دیتی دوو پیاوی گەنج و حەیزەران لە مست گەیشتنەلای و گوتیان:

— ئەوە بۆ دانیشتوویت؟.

— هێزم لەبەر بڕاوەو ناتوانم چیتر بڕۆم.

بێ چەندو چۆن قیتیان کردەوەو یەکێکیان سواری سەر پشتی بوو.و ئەویتریش بە حەیزەرانان لە پاشەڵی دەداو هەتا سەرکەوتن. کابرا ئەوسا ڕووی لە ئاسمان کردەوەو گوتی:

— خودایە دیارە تۆ لە داواکەی من نەگەیشتوویت.

## ٩-خوشکی گەورە ڕازییە:

لەسەرەتایی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا ڕۆژێک لەنێو پاسی ((مەسلەحە)) دانیشتبووم، دۆستی دڵسۆزو ئازیزم ((لە ژیاندا نەماوە و ناتوانم ناوی بهێنم)) بە خۆ.و خێزانییەوە هاتنە پشتە من سوار بوون.

دوای بەخێرهاتنێکی گەرمو گوڕو پارەدانیان ڕووی خۆم بۆ.. وەرگێڕاو بە شێوەیەکی ئاسایی یەوە پێمگوت:

— مامۆستا ئەو((٣٠٠)) سێ سەت دینارەی داوتە خوشکی گچکە دەڵێت: ((

— ژنی هەیەو مێردی پیناکەم)). کەچی خوشکی گەورە ڕازییە. جا ئەگەر خوشکە گەورەکەت دەوێت: باشە. ئەگەرنا بڕۆپارەکەت بینەوە.

پاش دەپازدەڕۆژان لە نێوبازاڕی ((توورو سلق)) فرۆشان، جمەی لە خەڵکەوە دەهات، تووشم بوو.و هەر لە دوورەوە تفێکی گەورەی لە دوڕچاوم کردو گوتی:

— عەزەی خوێڕی تۆ ئەودەر دەت بۆ دامن!.

منیش بیرم بۆ قسەی پێشتر هەرگیز نەدەچوو.و گوتم:

— دەردی چی!؟.

گوتی:ـ

— خودا دەزانێت یەك هەفتە نانم لێحەرام کرا. هەتا رۆژێك خوشکە ژنم هات و دەستنوێژیان پێ شۆردەو قورنانم خواردووە و گوتم: ئەو کابرایە درۆ دەکات ئەو جاباوەڕی هات.

### ١٠-خۆت ماوێ سەرم:

پیاوێکی کەمێك گێلو نەخۆش میزی فەحس دەکات. لەبەر کەمتەرخەمی بەرپرسانی ((موختەبەرەکە)) ناوی کابرا، بەهەلە لەسەر شووشەی ئافرەتێکی دووگیانی دەنووسرێت. هەر کە ئەنجام دێتەوە بەکابرای دەڵێن:

— تۆ زگت هەیە.

ئەویش ئەوسا باوەڕی دێتو سەری غەزەبی لە ژنەکەی خۆی با دەدات دەڵێت:

— حورمێ چەند جارم پێگوتی:

— کچێ خۆت ماوێ سەرم کچێ خۆت ماوێ سەرم : هەتا ئەوهام بەسەرهات.

### ١١-خۆ چ ناتخۆم:

کابرایەکی ناوچەی ((شاربازێڕ))ی سەربەشاری سلێمانی، خۆراکی بەزۆری نانە ((هەرزن)) دەبێت. رۆژێك دەچێتە ناودەستو هەرچەند هەوڵو تەقەلا دەداتە بەر خۆیەوە گووی دەرنایەتو دەڵێت:

— دەسەر بێنە دەرەوە خۆ چناتخۆم.

## ١٢-خۆزگە گونت بوومایە:

لە زەمـانی زوو ((قائیمـە قام))ێـك دەچـێتە گونـدێك تـاكو بـاج و زەریبەی حكومی وەرگرێت.

هەركـە دەگاتـە جـێ خەڵكەكـە دەورەی دەدەن و لـەپێش هـەمووان پیاوێكی پووزەو بەژن كولەبنە دەڵێت:

—بەگم ئەم ساڵ نەهاتەو دەستمان زۆر كورتەو داوا دەكەین لە هەرچی باج و زەریبەیە خۆش ببێت.

ئەویش تورە دەبێت و بە هەڵچوونەوە دەڵێت:

—تۆ دەڵێیت گونی پیاوی لە زێدە لەو خەڵكـە حـەقی قسـە كردنت نییە.

كابرای پووزە بە پێكەنینەوە دەڵێت:

—خۆزگە گونت بوومایە، بـەرِۆژ حەرەسـی قـوونی جـەنابت دەبـووم و بەشەویش حەرەسی قوونی خانمەكەت.

## ١٣-خۆشەویستی زاوا:

زاوایەك سەردانی ماڵی خەزووری دەكات.

ئێوارە هەركە چێشت داندرا خەسووەكە چووە مەلاكە ڕوونێكی تایبـەت لە نێو قاپە شیوی زاوا كرد.

لە دوبارەكردنەوەدا دەڵێت:

—نەوەك شیوەكەت بـێ ڕوون بێت.

ویستی سـێبارە هۆبداتـەوە، خەزوورەكـە دەڵـاز دەچـێت هێـزەی ڕۆن دەهێنێت و دەركی لە دەمی زاوا دەكات و دەڵێت:

— سەگباب دەوت بکەوە خەسووت بەو حاڵە نەبینێت دڵی داناکەوێت.

**١٤-خێر دیتم لەعەولافات:**

کابرایەکی ناوچەی پـردێ مـەڕێکی لـە وەرزی هـاوین دا دەباتـە لای دۆستێکی مەڕدار لە گوندی ((عەولافات))ی ناوچـەی کەنـدێناوە. سـاڵ وەسووڕاوە کابرا، بەدوای مەڕەکەی داچوو. عەولافاتییەکە گوتی:

— مەڕەکەت لەچلەی زستان زاناو بەرخێکی نێـری بـوو.و بـە داخـەوە بەخۆی مرداربووەوە. بەرخەکەشی ئێستا بووەتە کاوڕ.

ئەویش پەت لەملی کاوڕەکە دەکاتو لەگەڵ خواحافیزیدا دەڵێت:

— خێر دیتم لە عەولافات: مەڕبردم کاوڕ هاوردم.

## پیتی - د -

### ١.دایەی جاشکەکەیە:

شێخێکی بەناوبانگی شارێك بەرگوێی دەکەوێت ((مەرقەد))یەك لەناوچیاو هەڵەتی ناوچەکەدا پەیدابووەو خەڵك پەیتا پەیتا دەچنە زیارەتی.

ئەویش دەبێتە مەراقی کەتا ئێستاچ مەرقەد لەوکەرخەی باسی دەکەن نەبووە. چ جای ناو دەنگی. بەخۆیو چەند دەروێشەوە دەچنە زیارەتی.

شێخ هەر کە سەیر دەکات: خاوەن مەرقەدەکە دەروێشێکی خۆیەتی . پاش چاكو چۆنیو هەواڵ پرسین شێخ بە دزی وەبەرگوێی کۆنە دەروێشەکەی هەڵدەداتو دەڵێت:

— ئەو مەرقەدە هی چ شەخسێکی پایە بەرزە؟.

ئەویش بەتەوازووەوەدەڵێت:

— قوربان ئەوجاشکەی داتە من لام ئەوەندە پیرۆز بوو نەبێتەوە. هەرکە گەیشتمە ئێرەو هەڵدێراو تۆپی. منیش هەر لە شوێنی خۆی قۆرتێکم بۆ لێداو خستمە ناویو سەریشم وەك گۆڕ بەبەردان هەڵنا. لەخەفەتان هەتا سێ ڕۆژان لەسەری دانیشتم.

لەو سێ ڕۆژەدا دووسێ ڕێبوار هاتن‌و دەستیان بە بەردەکانی دا هێناوما چیان کردو یەك دوو بەردیشیان بۆ تەبەرووك بردەوە. هەندە پارەشیان دامێ. منیش ئەوسا حسیام ناو دەردەکات.هەندە جل‌و جۆری بەری خۆم بەسەر دووسێ دارەوە کردو لە پێپینگان‌و سەرینگانیم چەقاندن.

ئیتر هەفتەیەکی زیاتر نەبرد دەنگی دایەوەو خەڵك کۆمەڵ کۆمەڵ، لەهەرلاوە دەهاتن. پارەم زۆر بۆ دەهات‌و خانوو.. و حەوشەو بەرەم لەسەر دروست کرد.

شێخەکە ئەوەندە پێکەنی تا ئاو لە چاوانی بازرەقەی بەستاو جاگوتی:

—دەنا مەرقەدەکەی منیش داپیری جاشکەکەی جەنابتە.

**٢. دار لاستیك:**

کوڕێکی گێل ژن دەهێنێت‌و بە زاوا نابێت‌و دەچێتە لای مەلا دوعای بۆ بکات‌و دەڵێت:

—هەرچەند هەوڵ دەدەم کێرم سەر چیخ دەچێت.

مەلاش دار لاستیکی دەداتێ‌و پێیدەڵێت:

—بەمە سەری کێرت پێ نەوی بکەوە.

کوڕە بەو شێوەیە بەزاوا دەبێت و دار دوو لقەکەی بۆ مەلا دەباتەوە.

کەچی مەلا پێیدەڵێت:

—لای خۆت هەڵگرە. ڕۆژێك دادێت کێرت ملی شۆڕ دەبێت‌و دەچەمێتەوە. ئەوسا سەری پێ قیت بکەوە .

**٣. دایکم وه دەڵێت:**

ڕۆژێــك كۆمــەڵێك جــوامێرو ڕدێــن ســپی دانیشــتبووین. لــەناكاو منداڵێكی شەش حەوت ساڵان، بەهەڵە داوانەوە هاتە لامــانو ڕووی بـــێ پەردەی شەرمەوە لەمنی حەفتا ساڵ كردو گوتی:

—تۆ پیاوێكی بێناموسیت.

لەشروان هاروهاج بوومو چاوی دەغەزم چووە پشتە ســەرمەوەو ویســتم زارهەڵێنم، كەچی ئەوەی تەكمەوە، بەهەڵچوونەوە گوتی:

—هەتیو دەوت بگرە. دەزانی چتگوت!.

—بەڵێ دەزانمو زۆریش بێناموسە.

منیش پشكم دەهێناو یەكێكی تر بەدەنگی غەزەبەوە گوتی:

—هەتیم تۆ چیت لێدیوە..هەتا..نەو گووانە بخۆیت!.

—نەخێر.

—ئەدی چۆن وەدەڵێیت هەی ..............

—دایكم وە دەڵێت دایكم.

واژی بوونەوەی ڕاستییەكە بووە جەلعە ئاوێكی شەوی‌و بە تۆقی سەرم داكــراو لــە جێگــەی خــۆم ســاردبوومەوەو ئەگــەر مــردن لەوســاتەدا بــە پارەبووایە دەمكڕی. ناچار چاوی مۆنیم بەخۆمدا شۆڕكردەوە.

**٤. دایكی خێوی بگێم:**

تازە لە جیاتی ((درودی خوای لێ بێت)) ئەمە ((د.خ)) دەرچوو بوو.

ڕۆژێك لەكاتی دەرس گوتنەوە قوتابییان لــە مامۆســتاكەیان ((مــەلا مودەڕیس))بوو دەپرسن: مامۆستا ((د.خ)) مانای چییە؟.

ئەویش یەکسەر بە گوێرەی پیتەکان دەڵێت:

– مانای ((دایکی خێوی بگێم)).

**٥ـ دە ئەو جارەش بیلێوە:**

ئافرەتێکی پەروەردەی نێو شارستانییەتی سەردەم گوتی:

– کێری پیاوەکەی من لەبن پەنتلۆن سپی و لووسە هەرزوو دەچێتە ناو عەورەتم.

ئافرەتێکی دەشتەکی گوێی لێدەبێت و دەڵێت:

– دەناکێری مێردی من لەبن ڕانکەو زۆر دڕو ڕەش و قەد ئەستوورو سەرگەورەیە.

ئافرەتی یەکەم بەدەم بەشبوونەوەی سەرسوڕمانی سوقەوە دەڵێت:

– دەئەوجارەش بیلێوە.

**٦. دەبێ ئەوجارە:**

سەردەمایەك گوندەکانی خۆشناوەتی جادەیان بۆ نەچوو بوو. هەموو ئوتۆمبێلێك نەیدەتوانێت بچێت. ئەوەی دەشچوو بە زۆری جێب بووە. هەڵتەك هەڵتەکی زۆر بووە. سواربووانی پشتەوەی پێ هەراسان دەبوون.

هەرجێبێك بچووبووایە گوندێك دەبووایە سەر لە ئێوارە نەفەر لای پێشەوەی بۆ خۆی بەڕادان بدات. ئەگەرنا بەری نەدەکەوت.

ئێوارەیەك ئافرەتێك دەچێتە لای شۆفێری ئەو جێبەی ئامە شۆی دێیەکەی دەکرد و دەڵێت:

– کاکی شۆفێر تۆ هەموو جارێ لەپاشەوەم دەنێیت، دەبێ ئەوجارە لەپێشەوەم بنێیت.

شۆفێرەکەش دەڵێت:

-باشە، دایە باشە.

**٧. دەبێ بەداخی گانەوە سەربنێتەوە:**

((حەمە شەریف))ی برای مەلای ڕەش لەگەڵ ((٣)) کەسی ناوچەکە سەفەری حەج دەکەن.

ڕۆژێك لەبەر نەخوێندەواری و فەقیرحاڵی خۆیان هەرچواریان بزر دەبن. یەکێکیان لەخەفەتان دەست بەگریان دەکات.

حەمە شەریف لە ژیانـدا زۆر قسە خۆش‌و سوحبەتچی بووە بەپێکەنینەوە پێیدەڵێت:

—وەللا بچمەوە ژنی ئەو دووانە مارە دەکەمەوە: تەنیا ژنەکەی جەنابت نەبێت. دەبێ بەداخی گانەوە سەر بنێتەوە.

**٨. دەتوانی قەردەکەی بدەیتەوە:**

ئافرەتێك دەچێتە لای مەلایەك‌و دەڵێت:

—مامۆستا مێردەکەم، پێش مردنی زۆری داوا کرد لەگەڵی جووت ببم منیش نەمسەلماند. دەبێ گوناحم نەگاتێ؟.

مەلا گوتی:

—ئەمڕۆ دەتوانی گوناحەکەی لەسەر خۆت لابەریت‌و قەردەکەی بدەیتەوە.

**٩. دختۆری کەپوو.و گێ:**

پیاوێکی شاری هەولێر، لەشاری سلێمانی لووت‌و گوێی ژان دەکەن‌و لەیەکێك پرسیار دەکات:

- ئەرێ کاکە دختۆری کەپوو.. و گێ لە کێندەرە؟.

ئەویش بە پێکەنینەوە دەڵێت:

- دختۆری قوون گێم بیستووە، بەڵام هەرگیز دختـۆری کـەپوو و گـێم نەبیستووە.

**١٠. دراوی سەر:**

((مام حەمـەد)) پشـت کـوور، دەسـتو پێوەنـدی مـاڵی ((عـەلی ئاغا))ی مورتکە بوو. ژنێکی گێلۆکەی هەبوو.

شەوێك چەند گەنجی ئاوایی، یەك لـە ئەوانـە بەنـدەبوو، جلوبـەرگی بووکیمان لەبەر خوالێخۆشبوو ((موحەمەد نۆمەر))ی فەراشی قوتابخانـە بوو کردو کڵاو دەسرۆکێکیشمان لەسەر ناو بە چەپڵەو بەستەو مقام گوتن بردمانە ماڵی مام حەمەد. چراش پێبوو. بەس ئافرەتەکـەی چـاوی تـەواو نەبوو.. و هەستی نەکردبوو کە پیاوە. لە تاوان شێتو هاربوو.و بـە پرتـەو بۆڵەوە شەش حەوت کەرەت لەبەردەمی هاتوچـۆی کـردو پاشـدان لەگـەڵ گوتنی: ((

- دێڵە حیتە تۆ.. و حەمەدیان گوتووە!.

هەتا چەپۆك گرتی لەتەپڵە سەریداو گوتی:

- بڕۆنێ، بڕۆنێ ئەو قاحبەیە دراوی سەری چەند زۆرە دراوی سەر.

**١١. دەرمانچایە:**

لەسـەرەتای پـەنجاکانی سـەدەی رابـردوودا لـە حـوجرەی گونـدی ((لاوەر))ی بناری باکووری خۆرئاوای چیای ((قەرەچوغ)) دەمخوێند. ئەوسا سوختەبووم. دەرمانچایەمان لە حوجرەدا نەماو منیش چوومە ماڵێكو.

— ئەرێ ئەگەر هەتانە جەمەك دەرمانچایەمان بدەنێ؟.

خاوەن ماڵەکەش لەنێو گۆڵمی خۆیدا بۆی هێنام‌و لە نێو لچکە پشتێنی خۆم کرد.

هەرکە چایەکەمان لێنا دەتگوت: ((زەقنەبورتە)) ئەوەندە تاڵ بوو. بۆمان نەخوراوەو ڕێشتمان.

تومەز خاوەنەکەی دەستی زۆر کورت دەبێت‌و نەیتوانی بوو شەکر بکڕێت دەرمانچایەکەی لە پەڕۆکێکی کرد بوو لەبەر ساپیتەی خانووی ڕاکردبوو. نزیکە بیست شەو مانگێك دووکەڵی کاوکۆتی پێکەوتبوو ئەوها تاڵ هەڵگەڕابوو.

۱۲. درۆزن:

برادەرێکم هەبوو: ((لە ژیاندا نەماوەو ناتوانم ناوی بهێنم)). درۆی زۆر دەکرد. قسەکانی بەلای کەمییەوە لەسەتا شەست تا حەفتای درۆ بوون. کوڕێکی هەبوو، لەبەر تەمەن گچکەیی، ئەو ساڵە لە قوتابخانە وەرنەگیرا.

ڕۆژێك من‌و ئەو بەیەکەوە ڕاوەستا بووین. لەوساتەدا هەلیکۆپتەرێك، بەبان سەرماندا ڕەتبوو. کوڕەکەی تەنگە تاو هاتو گوتی:

— مامۆستا عەزیز تازە شوفیری ئەوهەلیکۆپتەرەی بەمنی گوت: ((

— ........کوویت؟)).

لەگەڵ باوکی دەستمان بە پێکەنین کردو منیش گوتم:

— هەر هەویلێ.

**١٣. درۆی ئاسمانان:**

لەنەوەی شێخ ڕەزایانم کە فەرموویانە: ((

– ئەگەر خودا سەروسیمایەکی جوان و قۆزو زمانێکی لووسم بداتێ رزقم لێیناوێت))

منیش لەم دووانە هیچ کەم و کووڕیم نەبوو. تەماعیش دین و مروەت بەرە.

فەقێ عەزیزی دراوسێمان کاتی خۆی قورئانی پیرۆزو عەقیدەو ئەحمەدی و ((عەوامیل))ی ((جورجانی)) خوێندبوو.و((فەقێ))ی بەدواکەوتبوو. ئەگەرچی هیچی لەبرەی دەرنەدەکرد، بەلام زمان لووس و لەبلە بانێکی وابوو شەیتانی لەخشتە دەبرد. کردمە ڕەفیقی سەفەرەکەم و برابەش لەهەرچی بە نسیبمان دەبێت. بەمەرجێك لەهەر جێگایەك ئەگەر قسەیەکی جرناو فرناو لەدەم دەرهات ئەو بەگوێرەی عەقڵی خەڵکەکەوە بیخاتە قالبی کەرامەتەوە.

ڕۆژێك لە دیوەخانێکدا لەسەر سفرەی خوان بووین من دوای چاوخستنە سەریەك و برێك ڕامان لەبەر خۆمەوە بە سەربادانی سۆزەوە هەڵمدایە:

– ئەللا هـ... دەنگی سەیانم لە عاسمانان لەگوێ دێت.

فەقێ عەزیز زەردەیەکی هاتێ و هەر زوو بەدەست لەسەر سینگ وەریگرتەوە و گوتی:

– فەرموودەکەی حەزرەتی شێخی پایە بەرز لە کونی کارك ڕاسترە.

خەڵکەکە لێکرا بەواق وڕمانەوە دیقەتیان دا دەم و لەوسی:

ئەویش بەشێوەیەکی ئاسایی یەوە گوتی:

—بارگینێك تۆپیوە، سەگی ئـاوایی ناوهـەناویان خـواردووە، پاشـدان دێڵەسەگێکیش لەناو دەندەرۆکەکە ترەکییـەو، چەند دالاشـێکی گـەورەو زەبەلاح لاشەکەیان لۆ حەوا بەرزکردووەتەوە، هەتا چ گۆشـتی پێـوە مـاوە، دوور لەسەیان بیخۆن. جا ئەوە دەنگی گوجیلەکانە وا لە عاسمانەوە دێت.

هەر کە لە ئاوایی یەکە دەرچووین فەقی عەزیز گوتی:

— کاکە من ئەلێرەدا شەرتم هەلاتو چیدیکە ناتوانم لەگەڵت بگەڕێم.

عاجباتیم پێهاتو پێمگوت:

—بۆ...!؟. لەنانەکەت ڕازی نیت!؟.

بەبزەیەکەوە گوتی:

— کێ هەیە خەزێنەی قاروون ببینتەوەو پێ ڕازی نەبێت.

— ئەدی لەبەر چتە؟.

دوای دەمێك بیرکردنەوە گوتی:

— ئەوەی ڕاستی بێت پێشتر درۆی عاردان بـوو، هەرچـۆنێك بـوو پـێم پێنەدەکرا، بەڵام ئەمرۆ کارگەیشتە درۆی ئاسمانانو توانـای پینـە کـردنێم نییە.

**١٤. دزی ترلی:**

((٦٥))شەستو پێنج ساڵ زیاتر بەر لە ئێستا دووکەس یـەکیان بـە تەمەن لە ئەویدی گەورەتر دەبێت:

((گەورەکەیان چووەتە ڕێگەی حەق‌و ناوهێنانیان پەسەند نییە)).
ئەوی گچکە فریو دەدات‌و بە ڕۆژ دەچنە دزی ترێی ڕەزی قەسری ئەحمەد چەلەبی.

کابرای پاسەوان لێیان وە ئاگادێت‌و ڕاویان دەنێت. ئەوی گەورەکە، بۆ ئەوەی پاسەوانەکە هەڵفریوێنێت. لەسەر جۆگەی ناوی ((میری)) لە ترسانا بە پێڵاوەوە ڕووەو خۆر ئاوا نوێژ دادەبەستێت.

پاسەوانەکە بەدەنگی بەرزەوە دەڵێت:

- کوڕە ئەو مەلعوونە خۆشی کافر کرد.

۱۵. دەزێی بزێ:

فەقێیەك دەچێتە گوندێك. ئافرەتی ماڵێك بە موشتاقەوە بەپیریەوە دەچێت‌و داوای لێدەکات نووشتەی منداڵبوونی بۆ بکات‌و دەڵێت:

— پارەکە فەقێیەك نووشتەی بۆ ((نازێ))ی جیرانمان کرد ئەوساڵ کوڕێکی بوو.. تۆش نووشتەیەکی ئەوها بۆ من بکە.

فەقێیەکە دەڵێت:

— دەئەو نووشتەم لۆبینە.

هەرکە نووشتەکەی دەکاتەوە تێیدا نووسرابوو:

— نازێ دەزێی بزێ نازێی بەکێرم.

۱٦. دەستی پێدا بهێنە:

مەلایەك ((لەژیاندا نەماوەو ناوهێنانی هەموار نییە)) لە مزگەوتی ((پیرێژن))ێ گەڕەکی ((عارەبان)) ئیمام دەبێت. یەکێك پێیدەڵێت:

— مامۆستا منارەی مزگەفتەکەتان زۆر کورت‌و ئەستوورە.

ئەویش بەناسایی یەوە دەڵێت:

—پێت خۆشە درێژ ببێت.

—بەڵێ

—برۆ دەستی پێدابهێنە درێژ دەبێت.

**١٧. دەستی تۆم شکاوە:**

شوانی مەڕدارێك زیز دەبێت.

ئاغای گوندی بەدوای داچوو نەگەڕاوە. مەلا چوو نەگەڕاوە. پاشدان جوامێرو ڕدێن سپیی چوون هەر نەگەڕاوە.

تا شوانێکی دۆستو هاوتەمەنی خۆی بەدوایدا چوو.و هەر لە دوورەوە کلکە گۆپاڵێکی لەپاشەڵیەوەی هەڵداو پێیگوت:

—وەرە بگەڕێوە خوێڕی.

ئەویش بەدڵسار دییەوە دەڵێت:

—چبکەم دەستی تۆم شکاوە دەنا بەتەمانەبووم بگەڕێمەوە.

**١٨. دەستێکت:**

کابرایەکی دێهاتی کوڕی شێت دەبێتو دەیباتە تەکیەی شێخێك لەشار. پاش چەند ڕۆژان بە دوایدا دەچێتو شێخ پێیدەڵێت:

—بیبەوە چاك بووەتەوە.

باوکەش زۆر هەوەستی پێدێتو پڕەداتە ماچ کردنی دەستی شێخو هەندە پارەشی دەداتێ.

بۆلای کوڕەکەی دەچێت. لەژێر زەمین دەبێت بە گوراح خۆشیەوە ئەملاو ئەولای ماچ دەکاتو دەڵێت:

– کورم سوپاس بۆخوا بەهیممەتی شێخ چاك بوویتەوە.

کورەش دەڵێت:

– بەڵێ بەهیممەتی شێخ چاك بوومەوە

باوکە دووبارە سوپاسی خوا دەکاتو ئەوجا دەڵێت:

– لەگەڵم دێیتەوە؟.

– بەڵێ. بەس بابەحەزم زۆر لەگانەو کەسیش دیار نییە دەرپێت لـەپێ بکەوە دەستێکت بگێم.

**١٩. دەنا.هەر کچە:**

پیاوێك ویستی بچێتە داخوازی ئافرەتێك پێیان گوت:ـ

– حەوت مێردی ککردووە.

ئەویش گوتی:-

– چی مەلا بووە؟.

– نەخێر

ئەوسا بەدڵنیایی..یەوە گوتی:

– دەنا هەرکچە.

**٢٠. دووبارە:**

کیژێك خۆی دەدۆڕێنێتو زگی دەردەکەوێت بابەکەی هەڕەشەی کوشتنی لێدەکات.

کچە دەڵێت:

– بزانە کورە کێیە؟.

دەڵحاز تەلـەفۆن دەکـاتو زۆر ناباـت کـورە گـەنجێکی یـەکجار قـۆزو تازەترین قەمەرە لەژێر پەیدا دەبێتو بە باوکی کیژە دەڵێت:

— ئەگەر کچ بوو ((٥)) پێنج ملیۆن دینارتان دەدەمێ.

خۆ ئەگەر کوڕ بوو ((١٠)) دە ملیۆن دۆلارە.

زاوا بە ئەوەندەش ناوەستێتو دەڵێت:

— ئەگەر هاتو هیچ نەبوو......

بابەکە ماوەی نادات و لێوەردەگرتەوەو دەڵێت:

— دووبارە برۆ.. وەگژی.

**٢١. دوو پیاو:**

دوو پیاوی نـاودارو پایـە بـەرز خوالێخۆشـبووان ((مامۆسـتا مـەلا ساڵحی کۆزەپانکەو سەید ئەحمەدی عەلە غێر))ی بـۆ یەکـەمجار ئاوقـای یەکتر دەبنو ئەمیان پاش ناسینو چاکو چۆنی لەگەڵ یەکتر بەسوحبەت بە ئەو دەڵێت: ((

— تۆ مەلا ساڵحی قوزە پانکەیت؟)).

ئەویش بەپێکەنینەوە دەڵێت: ((

— بەڵێ منم. بەس تۆی سەید ئەحمەدی عەلەعێری؟ )).

**٢٢. دوو ڕێوی:**

یەك لە شێخەکان ((ڕابـەر))ی قوتابخانـان دەبێـت. ڕۆژێـك دەچێـتە قوتابخانەیەك لەو سەرەوە لە ژووری ئیدارە دەبینێـت: وێنـەی ((سـەدامی دکتاتۆر)) بـە دیـوار هەلواسـراوەو لچـکێکی شـۆڕ بووەتـەوە. یەکـەر

هەڵدەستێت وێنەکەی جوان دەسڕێتەوەو لچکەکەی قایم دەکاتەوەو بە مامۆستاکان دەڵێتو:

— واجبە لەسەرمان هەروەکو خوا دەفەرموویت: ((

— وأطیعوا الله والرسول و أُلو الأمر منکم)) ڕێزی ئامیرمان هەردەم بگرین.

هەر کە دەڕوات لە نەورایی یەك تووشی هێندێك چەکدار دێت بە شۆفێرەکەی دەڵێت:

— ئەو چەکدارانە چنە؟.

— قوربان: پێشمەرگەنە.

هەر کە دەگاتە ئاستیان یەکسەر لەگەڵ دەست دەرهێنانی پڕ بە زار دەڵێت:

— ئەی ڕەقیب هەرماوە.....................

**٢٣. دووعا بکە:**

جوتیاری گوندێك مانگایەکی ئاوسی دەبێت لەکاتی زاندا خێزانەکەی دەڵێت:

— شاللا گۆلکێکی مێی دەبێت.

مێردەکەش پێشتر زۆر چووبووە گژ چێڵەکەو دەڵێت:

— ئافرەت دووعا بکە هەر گۆلك بێت.

### ٢٤. درو مارەیی:

لە ١٠-١٢-١٩٦٠دا هەتا ئەیلوولی سالّی ((١٩٦٣)) لـە ئـاوایی ((عەتێرە))ی ناوچەی قەراج عەرەبـی جبـوور نشـینو لەسـەر ((زێ))ی ((پردێ= ئالّتون کۆپری)) مامۆستا بووم. ئەمانەم لیّ بەرچاو کەوتن:

یەکـەم: ئـافرەتێکی بێـوەژنو بەتەمـەنو کـەپور ((ئەفنـەش)) لـە گوندەکە هەبوو. پیاوێك لە وەرزی بەهاردا خوازبێنی کردو مارەیی یەکـەی دووبزنو چێلێك بوو. گواستییەوەو دروونەو گێـرەی خـۆی پێکـرد. هەرکـە ئیشی فەلاحەتییەکەی کۆتایی هـات تـەلاّقی داو چێڵەکەو دووبزنەکـەی وەرگرتنەوە.

دووەم: باوکی قوتابییەکی خۆم لەناوایی ((داوگەمیر)) دادەنیشـت بـە ((٣٠٠)) سێ سەت دینار کچـێکی خواسـتو ماوەیـەك لـەکنی بـوو.و تەلاّقی داو پارەکەی وەرگرتەوە.

هـەروەها دووکچـی تـری بەپارەکـەی هێنـاو تەلا... ((٣٠٠)) سێسەت دنیارەکەشی هەرماوە.

### ٢٥. درو .. واریقاتی مام وەلی:

خوا لێخۆشـبوو: ((مـام وەلـی))ی بـاوکی دۆسـتی دلّسـۆزم ڕێـزدار ((ڕەمزی)).

یەکەم: قوتابـی دەبێت لەو قوتابخانەی کەلە شـوێنی (( پارێزگـای)) ئەمڕۆدا بوو. مامۆستاکە بەقوتابییان دەلّێت:

—دەبـی بەیانی دەرپێی قوتە بێنن، ڕیازەمان هەیە.

ئەویش بۆ بەیانی لەبیری دەکات. هەر کــە قوتابییــەکان خۆیــان ڕووت دەکەنەوە، ئەویش ناچار بەبــێ دەرپــێ کورتــەو عــەورەت بــەدەرەوە ، بــە ((یــەس، یــەم)) بــەپێش قوتابییــەکان دەکــەوێت. مامۆســتاکە هەرکــە دەیبینێت ماوەیەك پێی پێدەکەنێتو عەفووی دەکات.

دووەم: لەســالّی کــەرگێرانیێ= ((۱۹٦۳)) ((بــەدرەدین عــەلی))ی موتەسەڕیفی هەولێر، بەهۆی تۆمەتەوە بانگی دەکات و پێیدەڵێت:

— أنت شیوعی؟.

— لا

— أنت پارتی؟.

— لا.

— عەجەل أنت شنهو؟.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

— أنا رجعی مثلك .

بەمە لێیخۆش دەبێت.

**۲٦. دێوانەش فەرق ناکات:**

ڕۆژێك شێخێك بەخۆ.و خەلیفەو دیوانەو کۆمەڵێك دەروێشەوە دەچــنە شارۆچکەی کۆیی.

جەنابــی مەلای کۆیی جەواب بۆ کوێخا ((حەوێز))ی گوندی ((شاخە پیسکە))، پیاوێکی ناوداری ناوچەکە بوو دەنێرێتو دەڵێت:

— دەبــێ بێیت مەسەلەکی شەرعیمان هەیە.

ئەویش سەری سوڕ دەمێنێتو لەدڵەوە دەڵێت: ((

– جەنابی مەلا پرسیاری شەرعی لە یەکێکی نەخوێندەواری وەك من دەکات!)).

هەر کە دەچێتو پێیدەڵێت:

– کوێخا شێخو خەلیفەو دەروێش هەنە، ئەدی دێوانە چییە؟.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

– قوربان شێخ ژنی خەلیفە دەگێتو خەلیفە ژنی دەروێش دەگێتو دەروێش ژنی دێوانە دەگێت. کەچی دێوانە فەرق ناکات ژنی هەموران دەگێت.

## پیتی - ڕ -

**١-ڕەبـی ئەوەی موسڵمانە:**

کابرایەکی فەقیرحاڵ دەچێتە حەج. هەر کە دێتەوە خـەڵکی گوندەکـە، گەورەو بچووك بەپیریەوە دەچنو دەستو شانو قزڵی ماچ دەکەن.

هەر کە لێیان پرسی:

—ئەرێ ئەو سەفەرە پیرۆزە خۆشبوو!؟.

ئەویش لە ڕێگادا یەکجار زۆر ئەزیەتو ماندوو بوونی کێشابوو، بەئاخ هەڵکێشانەوە دەڵێت:

—ڕەبـی ئەوەی موسڵمانە ڕێی دەوێ ڕێی نەکەوێت.

**٢-ڕەبـی بەختیارەك نەمێنێت:**

لەتەمـەنی حـەوت هەشـت سـاڵیدا، هەرکـە نوێـژی مـەغریب لـە مزگەوت، بەجەماعەت دادەبەسترا، مـن دەچـووم لەکولانکـەی تەنیشـتی مزگەفت هەستم ڕادەگـرت. هەرکـە مـەلا دەگەیشـتە ((والا الضـالین)) دەمگوت:

—ڕەبـی بەختیارەك نەمێنێت دەبڵێن: ((ئامین)).

زۆربەیان لەبەر پێکەنین نوێژیان دەبڕی.جارێکیان ((خالـە موسا))
جوامێرێکی ئاوایی بوو.و تۆزێك قینچکە تەنگ لێم هاتە دەرەوەو منیش
غارمدا، بەردێکی ڕاوەشاندو لەسەرمی دا.

### ٣-ڕبە لەماڵی چ گەوادییە:

دووکەس لە گوندێکی دەشتی هەولێر سەریان بەیەکەوە نابوو.
یەکێکیان خۆی بەئاغا دەزانی‌و لە دەراوی ئەویتر ئاوی نەدەخواردەوە و
دەسەڵاتیشی نەبوو بەسەریدا زاڵ بێت‌و سوخرەو بێکاری پێ بکات.

بەهەر دوومالّ یەك ڕبەیان هەبوو.

ڕۆژێك ئاغاکە ڕبەکەی پێدەویست و دەیزانی لەماڵی کرمانجەکەیەو
لەخۆشی ڕانەدەدیت بڵێت:

— ربەکەم بۆ بێنن.

بەخۆشی عوجبی هەرگیز نەدەهێنا بچێت.

ناچار بەم جۆرە، بەڵکی کرمانجەکە ڕبەکەی بۆ دەهێنێت‌بە دەنگی زۆر
حێلەوە دەڵێت:

— ئەریٚ ڕبە لەماڵی چ گەوادییە.

.............................................

ڕبە= دەفرێکی دەغلّ پێوان بووە. دوازدە مستی گەورەی دەغلّ دەگرت.

٤-ڕەحمەت لەوی، لەبابـی وی:

ڕۆژێك لەنێوبازاڕی شاری هەولێر دەڕۆیشتم. بەداخەوە لەبیرم نەماوە چ ساڵێك بوو، بەلاّم سی چل ساڵ دەبێت. کابرایەکی پیرو جلو جۆڕ شڕ بەکنم دا تێپەڕیو منگە منگی لێوە دەهاتو من تێینەگەیشتم چدەڵێت.

هەرکە دووەم جار بەرچاوم کەوتەوە خێرا خـۆم گەیانـدە نزیکـیو بـی ئەوەی هەست بکـات قـەرە بەقـەرەی هـەنگاوم دەنـاو توریندانـە هەسـت ڕاگربووم. تا تەواو تێیگەیشتم بانگی دەکرد:

— ڕەحمەت لەوی لەبابـی وی دوو کیلۆ شەکرو پاکەتە دەرمـان چـایەك لەناو مەقلییەکییەو لە دووکانێکم داناون، دووکانەکە لە کێندەرە هۆ.ی.

٥-ڕەسمی منداڵیمە:

من بەڕێوەبەری قوتابخانەی گوندی ((مورتکە))ی گەورە بووم. ڕۆژێك منداڵێکی گونـدی ((سەردەشـت)) نیـو سـەعات بـەپێیان دوورە هاتـە قوتابخانەو نـاویم لـە پـۆلی یـەك نووسـیو : ((ناوهێنـانی ڕەوا نییـە)) پێمگوت:

— دەبـی ڕەسمێکی خۆت بۆ سجل بێنیت.

ڕۆژی دوایی وێنەیەکی هێنا قەفی سمێڵی پەنجەیەك دەبـوو.. و چـەفیەی سەریشی گوڵێنگدار.

گوتم:

— کوڕم ڕەسمی خۆت بێنە.

گوتی:

— مامۆستا ئەوە ڕەسمی خۆمە.

منیش پەست بووم‌و گوتم:

– کوڕە تۆ کەری، گێلی ئەوە کەی ڕەسمی خۆتە.

– مامۆستا بەحەقی خودا ڕەسمی خۆمە، بەڵام هی کاتی منداڵیمە.

**٦-ڕوو لە کێندەر بکەم:**

پیاوێك چووە حەج‌و بەرامبەر کەعبەی پیرۆز دووعای دەکردو دەیگوت: ((خودایە من زۆر زەمی ((فلان عەشیرەت))م کردووە ((من لێرەدا ناتوانم ناوی بهێنم)) ئێستاش تۆبە جارێکی دی زەمیانم بەسەر زار دانەیەت)) .

لەوساتەدا حاجییەك لە عەشیرەتەکە هاتە لای‌و پێیگوت:

– ئەرێ کاکە لە نوێژدا ڕوو لە کێندەر بکەم.

کابرا بەسەر بادانەوە دەڵێت:

– دەوجا وەرە بەخۆم بوودستم زەمیان نەکەم.

**٧-ڕووی ئەوها ڕەش کردووە:**

کابرایەك لەیەکێك لە گوندەکانی دەشتی هەولێر دەم‌و چاوی زۆر.. ڕەش دەبێت.

خۆشناوێك ترێی بۆ فرۆشتن دەباتە گوندەکە.

کابرای ڕەش دەڵێت:

– ترێی بەچەند دەدەیت؟.

خۆشناو دەڵێت:

– سەر بەسەر بە گەنم.

– گرانەو دەبێ بەیەك‌و نیوی ترێی بدەیت.

– لۆم دەرنایێنێت.

– دەنا..دەبــی بار بکەیت.

خۆشناو لەکاتی ڕۆیشتنیدا ڕوو لە خەڵکەکە دەکاتو دەڵێت:

– خزمینە قسەیەکی دەکەم لێم بەحەرەج مەگرن.

خەڵکەکەش سرکانە هەستی بۆ ڕادەگرن.

– خوای تەبارەك‌وەتەعالا لە دنیادا ئینتیقامی والێوەرگرتووەتەوە ڕووی ئەوها ڕەش کردووە.

**٨-ڕووی بابم ڕەش ببێت:**

جوتیارێك هێندە دەغڵ دەچێنێتو ڕوو لە ئاسمان دەکاتو دەڵێت:

– خودایە شەرتە ئەگەر ئەوساڵەت کردەهات دەغڵەکەم لەگەڵت بکـە مەنیوە.

وابوو هاتێکی زۆر چاك بوو.. و دەغڵێکــی زۆری هــاتو ئەوســا ڕووی لەحەوا کردو گوتی:

– پێم ناڵێیت: کێلاوتە، تۆت کردووەو دووریتتـەوە، ئاخرچـت کـردووە هەتا لەگەڵت بکەمە نیوە؟.

پاش دوو ڕۆژان شەوێك گەواڵە بارانێکی زۆر گەورەو بە ئــاوی هێنــاو لافاو لــە ڕەوسـەکەیدا و هــەمووی بــردو قــەت بڵێیــت بــن جۆخینیشــی نەهێشت.

جوتیارەکــە پێلاوەکــانی پــڕ ئــاو بــوونو زوو بــۆ ئــەوەی چــارەیەکی دەغڵەکەی پێ بکرێت، لە پێیکردنــەوەو هیچــی بــۆ نــەکراو دەســتی لــە قونگی خراری ئومێد بڕاو ئەوجا گوتی:

– دەبرووسکەیەك لێدە هەتا پێلاوەکانم دەبینمەوە پێلاو.

ئەوجا بە ناخەوە گوتی:

– یاخوا ڕووی بابم ڕەشبێت وەکی شەراکەتم لەگەڵ تۆ کرد.

**٩-ڕیش:**

سێ چوار دەروێشــی ڕدێــن گــەورەی شــاری هــەولێر دەچــنە زیــارەتی مەرقەدی ((کاکە ئەحمەدی شێخ)) لەشاری سلێمانی.

مێرد مـندالێکی مـەفتووقو قەشمەرباز ڕووی لــە یــەکێکیان دەکــاتو دەڵێت:

– خاڵە ئەو ڕیشە چییە؟.

ئەو بلەزو گوراح خۆشییەوە پێیدەڵێت:

– چمان باوکت ڕیشی نییە!؟.

– نەخێر.

– ئەگەر چوویتەوە داوای لێ بکە هەر زوو ڕیش بهێڵێتەوە.

– بۆ..؟.

– چونکە گووی دەگێڕتەوەو نایەڵێت: بگاتەدەمی.

– چۆن؟.

– دایکت ئەگەر ئێستا جوێن بەتۆ بدات دەڵێت: ((

– گوو بەدەمی باوکت بێت)) ، کەچی ئەگەر .. ڕیشی هەبێت دەڵێت:

– گوو بەڕیشی باوکت.

### ١٠-ڕێوی دەکرێتە مەلا:

ڕێویەك بەمریشکی ئاوایی یەك فێر بوو بوو. شەو بیری نەدەکرد. هەرجارێش مریشکێکی بەنسیب دەبوو. خەڵکەکەی بەجارێك هەراسان کرد بوو.

تاکو کوڕوکاری ئاوایی بڕیار دەدەن ڕێوییەکەی بگرن. شەوێك هەریەك دووانێکیان لەپەناو پەسارگەیەك خۆیان دانووساند. هەرکە ڕێوییەکە دەگاتە. نێو دێ توانیان بیگرن. یەکێکیان گوتی:

—پەلێکی ببڕین و بەرەڵلای بکەین

—نەخێر.. تەنیا کلکی ببڕین.

مەلای گوندی لەو دەمەدا پەیدا بوو. ئەوساش کەس حەدی نەبوو دژی قسەی مەلا بووەستێت.

مەلا ڕێوییەکەی لێساندن و پارچەیەکی لە مەندیلە سپییەکەی خۆی کردەوەو لەسەرو گوێلاکی ڕێوییەکەی شەتەکداو بەرەڵلای کرد.

مەلا هەر کەدیتی خەڵکەکە بەکارەکەی پەست بوون گوتی:

—خەم مەخۆن کردمە مەلا. مەلاش رزقی هەردەم سوارە. پاش دووسێ ڕۆژی دی خۆراکی چنگ ناکەوێت و دەمرێت.

سێیەم ڕۆژ دوای بەرەڵلاکردنی ڕێوییەکە قسەی مەلای راست دەرچوو، بەڵام لەبرسان نەبوو، بەڵکو لەترسی پارچە مەندیلەکەی سەری ئەوەندە غار دەدات هەتا لە هیلاکیان فەراقی حنتەی لەبەر دەبڕێت.

# پیتی - ز -

**١-زەرگە زەوی:**

((زەرگــە زەوی)) گیایــەکی بەهارییــەو پــەلکی دەرەوەی لــە شــێوەی ((تەڕەتوولە)) باریكو بچووكە. ژێرەوەی سەلكی هەیەو دەخورێتو تۆزێك تفتە.

ئێمەی منداڵ هەر کە زەرگەزەوییەکمان هەڵکەناند بووایە، لـەکاتی سپی کردنی بنەزەرگەزەوییەکەمان لەدەمی ((پیشەقان))ە کەی دەستمان دەداو پەلکەکـەی هەڵـدەوەری. ئەگـەر هاوڕێیـەکمان لابووایـە ڕوومـان تێدەکردو دەمانگوت:

—زەرگەزەوی داکت بەبن بابت کەوی.

—زەرگەزەوی داکت بەبن بابت کەوی.

جـوێن پێدراوەکـە دەلحـاز زەرگەزەوییـەکی هەڵدەقانـدو جوێنەکـەی پێدەداوە.

جارێك برادەرێکی خۆم کاتی سپی کردنـی بنـە زەرگـە زەوییـەك ڕووی لەمن کردو گوتی:

—زەرگە زەوی مەلا ژن بەبن مەلای کەوی.

منیش بە توورەیی یەوە چووم زەرگە زەوییەکم کردو جۆینەکەم پێداوە.

**٢-زۆر سوپاس:**

بۆ کاك ((رەسوڵ سوڵتانی))لە رۆژی هەڵاتی نیشتماندا، ئەمانەی بۆ ناردووم.

**یەك: دەڵێی حاجیت:**

سەید قادر سەیادەت ئەوکاتەی ماڵی لە گوندی ((جەمیان)) بوو دێمێکی گەورە دەکاتە گوڵە بەڕۆژە. ڕۆژێك خەبەری دەدەنێ: کە شوانێکی ئاوایی مێگەلە مەڕەکەی کردۆتە نێو گوڵەبەڕۆژەکەوەو هیچی نەهێشتووە.

سەیدقادر بە توورەیی یەوە دەچێت بۆلای شوانەکە.

شوانە لە دوورەوەی دەبینیو دەزانێت زۆر توورەیە، بەهەلەداوانەوە، بەرەو پیریەوە دەچێت.

سەید قادر دەڵێت:

– کورە ئەو مەڕەت بۆ لە گوڵەبەڕۆژەکەی من کردووە؟.

شوانە بە پێکەنینەوە دەڵێت:

– قوربان خۆ زەرەریان نەداوە: گوڵەبەڕۆژەکان بەرزنو مەڕەکان. دەمیان نەگەیشتووەتە گوڵەکانو هەر گەڵاکانیان خواردووە. تۆ.. وەرە تەماشاکە هەموویان دەڵێی: حاجین پانتۆڵەکەیان داکەندووە.

سەید قادر کە ئەوە دەبیستێ دەست دەکات بە پێکەنینو توورەیی کەی دەنیشتەوە.

دوو: ئەیەڕۆ:

مەحموود قوتیلە کابرایەکی شۆخیبازی شاریکەندی بوو دەیگوت: ڕۆژێك لەگەڵ خێزانم دانیشتبووین پێمگوت:

—ژنەکە زۆر نەخۆشم پێموایە: هەردوو ڕۆژی دیکە دەژیمو دەمرم بەجێتان دێلم.

ئەوسا خێزانەکەم لەگەڵ دەست خستنە سەردەمی و گوتی:

—ئەیە ڕۆ: کابرا گیان گووت خوارد، شاللا نامرێت!.

سێ: سزای میزکردن:

—مامەند ئاغای ((شەختان)) نەخۆشی میزە چوڕکە دەگرێتو ناچار بوو، لەهەر جێیەك زۆری بۆ بهات بووایە میزی دەکرد. چەند جار لە نێو شاری ((مەهاباد)) لە کۆلانو شەقام میز دەکات.

سەرۆکی ئەو دەمی کەلانتەری = ((قۆلچی ناوشار= بەلەدییە)) کەئەمە دەبیستێت، بە پاسەوانەکانی ناوشار دەڵێت:

—لەهەر کوێ مامەند ئاغاتان دیت میز دەکات بیهێنن بۆ کەلانتەری.

ڕۆژێك پیاوی گۆرین دەگاتە نێو شارو میز زۆری بۆ دەهێنێتو هەرکە هەڵدە تررووشکێت دوو پاسەوان دەست دەنێنە سەر شانی و دەڵێن:

—کاکە فەرموو با بڕۆین بۆ کەلانتەری.

مامەند ئاغا بەحەیرمانەوە دەڵێت:

—بۆ چیبووە!؟. خۆ هیچ کارێکی خراپم نەکردووە، بۆ دەمگرن؟.

پاسەوانەکان دەڵێن:

– لەویّ روون دەبێتەوە.

کە دەگەنە کەلانتەری، سەروان دەڵێت:

– لەبەر ئەوە لە کۆڵانو شەقامان میز دەکەیت، دەبێ((١٠))دە تمەن سزا بدەیت.

ئەویش دەڵێت:

– جەنابی سەروان زۆرە خودا هەڵناگرێت: دەتمەنم جەریمە بکەیت. ئەخۆشمو ناچارم، بۆیە لەهەرکویّ زۆرم بۆ بێت میز دەکەم.

سەروان ناسەلمێنێتو دەڵێت:

– کەیفی خۆتە: یان دە تمەن، یان دوو ڕۆژ زندانی.

پیاوی تایەن: ناچار دە تمەنەکەی دەداتیّو دەڕوات. دەگاتە ((عەتەبە))ی دەرگاکەو دەگەڕێتەوە، دوو تمەنی دیکە لەبەردەمی سەروان دادەنێت.

سەروان ئەوسا دەڵێت:

– ئەو دوو تمەنە چییە؟.

ئەویش دەڵێت:

– جەنابی سەروان: باسەر شۆڕی شاهەنشای ئاریامیهر نەبم لەوەختی میزکردنەکەدا بایەکم لێبەربوو.

.................................

**چوار: بەکشمیش دەڵێن مێوژ:**

مامۆستا حەقیقی ڕۆژێك خزمێکی بۆ ((سەردەشت)) دەچێت. کابرای خزمی خەڵکی ناوچەی چۆمی ((مەجیدخان)) بووە . پێیدەڵێت:

– دوو سێ کیلۆ مێوژی بۆ بێنێت.
کابرا لەجیاتی مێوژ کشمیشی بۆ دێنێت.
مامۆستا پێیدەڵێت:
– ئەوە چییە هێناوتە؟.
– مێوژە بۆم هێناویت.
– کورە ئەوە کشمیشەو لێرەش زۆرە. بۆیە پێمگوتی: لەسەر دەشت بۆم بێنە چونکە مێوژی ئەوێ باش‌و بەناوبانگە.
– وەڵلا مامۆستا من نازانم: ئێمە بەهەموو ترێیەکی وشک کراو دەڵێین: مێوژ.
مامۆستای تایەنیش لە داخانا ئەم بەیتە شیعرە دەڵێت:
– لەداخی خەڵکی ئەو خوارەی بە کشمیشی دەڵێن: مێوژ.
شەرتە ئەمن لەمەولا وە بە شێلانە بڵێم گێوژ.
پێنج: وامزانی:
عەلی حاجی ئەحمەدی ناچێت دەیگوت:
– لە ((ئاڵکەڵوو)) چووبوومە سەر شایی. میوانێکی زۆریان بوو. ماڵە زاوا. شەوێ هەرچەند کەسێك بۆ خەوتن چووینە ماڵێك. زەمانی زووش لێفەو نوێن کەم بوو. هەردوو نەفەرو سێ نەفەر بە لێفەیەك دەخەوتن.
گوتی:
– لە نیوە شەودا هەر کەوەخەبەر هاتم: هاولێفەکەم وردە وردە وا پشت ملم دەخورێنێت.

پێمگوت:

— ئەوا.. بۆ وادەکەیت؟.

گوتی:

— بۆ.. پشت ملی تۆیە. وەڵلا وامزانی پشت ملی خۆمە دەیخورێنم.

**شەش: خوازبێنی:**

کاك سەعید مسگری خەڵکی سەقز گێڕایەوە:

— خوشکم لە ئاڵکەڵوو شووی کردبوو . ڕۆژێك گوتی:

— سەعید کچێکی چاکم بۆ دیویەتەوەو قسەو باسم لەگەڵ بنەماڵەکەیانو کچەکە تەواو کردووەو ئەگەر پێت خۆشبێت لەگەڵ باوکمو چەند کەسان وەرن بۆ خوازبێنی .

— گوتی: منیش ڕانكو چۆخەی بوور زوو.و کلاشو سۆرانیم لێداو ڕۆیشتم. لەپێشدا خوشکم کچەکەم نیشان بدات. گەیشتمە ئاڵکەڵوو.. چوومە ماڵی خوشکم.

نیو ماڵێك بوو. چوار کۆڵەگەی تێدابوو. لە لای پەنجەرەکەوە دانیشتمو خوشکم بە دوای کچەکەدا چوو. هێشتا جێگەی قوونم گەرم نەکردبوو گورپە پشیلەیەك بەهێواشی لە دەرگاکە هاتە ژوورەوەو چوو لەبن هەر زاڵەکەی ڕوو بە ڕووم قنگەڵتسی دا.= ((هەڵتوتکا)).

دوای تاوێك خوشکم هاتەوەو کچەکەی هێنابوو. کچە زۆر ئاقڵانەو شێرە کچانە هاتە ژووریۆ بەخێرهاتنی کردم. دەتگوت: نانو پیوازمان بەیەکەوە خواردووە. لەگەڵ خوشکم لەلای دەرگاکەوە دانیشتن.

پشیلەکەش چاوی لێم زیت کردبووەوە . دۆستانە تەماشای دەکردم.

منیش چۆکێکم هەڵدابوو سۆرانییەکانم لەسەر دانابوو تەسبێح و لچکی سۆرانی شۆڕبوو بوونەوەو هێدی هێدی تەسبیحەکەم هەڵدەسووڕاند. ناگام لێنەبوو لەگەڵ تەسبیحەکەی دەستم کلکی سۆرانییەکەش هەڵدەسووڕێت. لە گورپەی بۆریش وابووکایە لەگەڵ ئەو دەکەم. لەکاتێکدا لەگەڵ کچەکە کەوتبووینە قسە، گورپەی چەمەری تەنگەتاو پڕیدا دەستم، منیش وا هەڵبەزیمەوە ترێکم لێبەربوو لە دوورە دەبیسترا. خوشکم و کچە دەستیان بەدەمیانەوە گرت. منیش زەرد هەڵگەڕام و.. وەك گۆزە ناوێکی گەرمم پێدا بکرێت هەموو گیانم لە نارەقە هەڵگەڕا. مردن بەپارە بووایە لەوساتەدا دەمکڕی. نازانم چۆن هەستامەوەو کلاشم لە پێکردو سوسکانە دەرپەڕیم.

هەرچەند خوشکەکەم دواکەوت و هەتا قەراغ دێ هەر بەدوامەوە بوو هەرگیز لە ڕووم نەهات بگەڕێمەوەو بڕا بڕا.. ڕووم لەو دێیە نەکردەوە.

**حەوت: بایەکە لەتۆ ئەمین ترە.**

سمایل ئاغای چەوگالی دەیگوت:

—ساڵێك باوکم لەسەر خەرمان گەنمە سوورەکەی فرۆشت و کڕیاریش هەر لەوێ پوولەکەی ژماردو دایە دەست باوکم. هەمووی گەلای ((٥٠)) تمەنی و ((١٠٠)) تمەنی بوو.کاتێك باوکم خەریکی ژماردنی بوو کزەبایەك هات لە دەست باوکمی داو پوول ((با)) بردی و بە دەشت بلاوبووەوە. منیش جحێڵ بووم بەدوای پوولەکاندا غارمدا بیانگرمەوە، کەچی باوکم گوتی:

—وەرە نەچیت، ڕاوەستە هەتیو بەخوا بایەکە لە تۆ ئەمین ترە.

هەشت: دوو ترتان لێخواردم:

کەریم حەلێ سەڵتە پیاوی خڕکەلەو نیمچە شێتی ((قاقلاوایی))ساڵێك ڕەنجبەری حاجی کەریمی شاریکەند دەبێت. ڕۆژێك حاجی کەریم هاوڕێیەکی حاجی دەبێتە میوانیو دوای بەخێرهێنانو مـن خۆشو تۆ خۆش حاجی کەریم داوا لە کەریم حەلێ دەکاتو دەڵێت:

—دەورێ چایی بێنە.

کەریم بەپەلە تاقمی چایەی دەباتو لەبەر دەمیان دادەنێتو لای دەرگاوە لەسەر چۆك دادەنیشێت.

حاجی ئەوسا دەڵێت:

—کەریم ((٢٠)) بیست تڕ بەردە، بیست تمەنت دەدەمێ.

حاجی میوانیش دەڵێت:

—بۆ دەتوانێت بیست تڕ لەسەر یەك بکات؟.

کەریم بێ سێو دوودەڵێت:

—بەڵێ قوربان زیاتریش دەتوانم

حاجی میوان دەڵێت:

—کەواتە منیش بیست تمەنت دەدەمێ.

کەریم تۆزێك خۆی شلو ئەم بارو ئەوبار دەکات لەگەڵ کەمێك پاشەڵ بڵند کردن دەست پێدەکات.

حاجییەکانیش بەتەسبیح دەیبژێرن. تا بیست تڕ تەواو دەبێت.

کەریم ئەوسا دەڵێت:

—تەواو بوو پوولەکەی بژمێرن.

حاجییەکانیش هەریەکەیان، بە فێڵ دوو تڕ بەر دەنکی تەسبێحەکەیان ناخەن دەڵێن:

—هەژدە بوو هێشتا دوو تڕت ماوە.

کەریم قوونی هەڵدێنێو دوو تڕی دیش بەردەدا. پوولەکەیان لێوەردەگرێت. لەوەختی لابردنی تاقمی چایەکە دەڵێت:

—حاجی نەڵێن: کەریم شێتەو نەیزانی دوو تڕتان لێخواردم.

**نۆ: ئەم دوو براژنە:**

رۆژێک ((عەلی خەندان)) ناوێک بۆ ریش تاشین دەچێتە سەرتاشخانەیەک. سەرتاشەکە دەڵێت:

—با ئەوەی بەردەستم تەواو بێت ئەوسا لە خزمەتت دام.

لەو سەرو بەندەدا دوولاوی بە شووشو سەرچەورو سمێڵ تراشاو دێنە ژوورەوەو گوتیان:

—کاکە دەتوانیت دەوری چاوو برۆمان بۆ هەڵگری؟.

—دوای ئەم دوو برایانە بە چاوان.

سەرتاشەکە هەرکە ئەوەی بەردەستی تەواو کردو دەڵێت:

—فەرموو کاک عەلی.

عەلی خەندان دەڵێت:

—جارێ ئەم براژنانە بەرێکەکاریان هەیە من پەلەم نییە.

**٣-زێدەت لێوەرناگرێت:**

سێ پیاوی دۆستی یەکتر، بەیەکەوە دادەنیشن یەکێکیان تەسبێحێکی باشی پێدەبێت: ((ناتوانم ناویان بهێنم)).

دووەم داوای لێدەکاتو دەڵێت:

— ئەو تەسبیحەم بدێ.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

— بەیەکێك.

دووەم زۆر تووڕە دەبێت . کەچی سێیەم بۆ ئەوەی هێوری بکاتەوە پێیدەڵێت:

— برام بۆ تووڕە دەبیت زێدەت لێوەرناگرێت: بە چەندی کڕیوە بە ئەوەندەش دەداتە تۆ.

٤-زێن حەجی زێن:

من منداڵبووم ڕۆژێك عەرەبی ((بەدو)) بە حوشتر قەسپیان بۆ فرۆشتن هێنا ئاوایی.

لەبەر دیتنی حوشترەکان خەڵکی ئاوایی بەبتوونی گەمارۆیان دان.

حاجییەکی ئاوایی ((لە ژیاندا نەماوەو ناتوانم ناوی بهێنم)) لەگەڵ یەك لە عەرەبەکان تێك گیراو عەرەبیشی نەدەزانیو لای خۆی جوێنی بەعەرەبەکە دەدا، ناوە ناوە بە دەنگی بەرزەوە دەیگوت:

— یابە وەللا ئانی چەلبی بن چەلب، یابە وەللا ئانی چەلبی بنی چەلب= ((یابە وەللا ئەمن سەی لەبابی سەیە)) .

عەرەبیش بەقاقایەکی حیلەوە دەیگوت:

— زێن حەجی زێن. زێن حەجی زێن = باشە حاجی باشە.

## پیتی - ژ -

ژنێکی شێت هەبوو هەموو ڕۆژێ لە بەیانی زووەوە، هەتا ئێوارە لەبەردەم چێشتخانەکەی بەرامبەر گازینۆی ((مەچکۆ))ی بەسەر دەبرد.ژنە بەتەمەن بو، بەڵام جل‌و بەرگی هەردەم جوان و ڕەنگاو ڕەنگ‌و باسکی پڕ بازن‌و بەر بازن بوو.

ڕۆژێك خاوەن چێشتخانەکە لێیدەپرسێت:

— ئەتوو مێردت کردییە؟.

— بەڵێ

— چۆن؟.

- بابم ئەوەلجار منی دامە لایەك. سەری کێری زۆر گەورە بوو.. و هەرجارێ گۆڵمە ئاوێکی تێدەکردم. مەلا مردو بابم ئەوجارە منی دایە پیاوێك چنەبوو.

## پیتی - س -

**١-سەدیق ماندوو نەبی، غەفوور بەخێر هاتی:**

نێــوان گونــدی ((مورتکــە))ی گــەورەو((مورتکــە))ی گچــکە نیــو سەعات ڕێیە بە پێیان.

خەڵکەکە لە شینو شایی بەدەستەوایی هەردوو گوندیان بە دوو گەڕەك حسێب دەکرد.

ڕۆژێك ئەم خوالێخۆشبووانە ((سەدیقو غەفوور))ی مورتکەی گچکە دەچنە مورتکەی گەورە.

غەفوور.. ڕوو لە مزگەوت دەکاتو ئەویتریش لادەداتە کــن برادەرێکــی لەسەر جۆخینان.

پیاوێکی یەکجار باشو بــی عەیبو خۆشەویــستی ســەرتاپای ئــاوایی ((لە ژیاندا نەماوەو ناتوانم ناوی بهێنم)) لەکاتی هاتنی غەفوور ئەو لــە مزگەوت دەبێتو لە منداڵییــەوە ناســیاری یــەکتر بوونــە لــەدوای ســەلام وەرگرتنەوە نازانێت کامیانەو دەڵێت:

—سەدیق ماندی نەبیت، غەفوور بەخێر هاتی.

٢-سەرەکەی باوێمە ناوێ:

ڕۆژێك پیاوێك لەگەڵ خێزانەکەی بۆ مریشك کڕین دەچنە لای مریشك فرۆشێك.

پیاوەکە لەنێو سەیارەکە دەبێت و ژنەکەی مریشکێك دەکڕێت و مریشك فرۆشەکە بۆی سەر دەبڕێت و لەنێو عەلاگەیەك دەنێت‌و دەڵێت :

—سەرەکەی باوێمە ناوێ.

ئافرەتەکە بە خراپ تێدەگات‌و بە ڕەنگ پەڕین‌و هەڵەداوانەوە بە مێردەکەی دەڵێت:

—ئەو بێناموسە بەمن دەڵێت: ((سەرەکەی باوێمە ناوێ)) .

هەردووکیان زۆرچاك سەرو گوێلاکی یەکدی دەکوتنەوە.

٣-سەرم هەر تێچووە:

پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندو قرچۆك‌و ڕەزیل نەخۆش دەکەوێت.

منداڵەکان دەورەی دەدەن‌و پێیدەڵێن:

—بابە نەخۆشییەکەت هەروا توندتر دەبێت، خۆت ئامادە بکە بۆ دەرەوەی وڵاتت ببەین.

بابە دەنگ ناکات.

—منداڵەکانی لەبێ دەنگییەوە حسیان ڕای لەسەر نییەو بەرۆکیان بەرنەداو گوتیان:

—خۆشی بێت ترشی هەر دەتبەین.

بەهەڵچوونەوە دەڵێت:

—لێمگەڕێن، باشترە.

- لەبەرچی؟.

بەکۆخە کۆخ سەری قیت کردەوەو گوتی:

- دەڵێم: لێمگەڕێن، تازە سەرم هەر تێچووە با ماڵەکەشم تێنەچێت.

٤-سەری مار دەکرێتە کەوچك:

ڕۆژێك چوومە تازییەی خوالێخۆشبوو: ((پلکە فاتم)) ناوێك لەشارۆچکەی ((شاوێس)). کاتی خۆی ناوبراو تەمەنی دوو ساڵ دەبێت: دایکی هێندە ((ماست))ی لەپێش دادەنێتو بەتەنیا لە ژووری ماڵەوەی بەجێ دیڵێت. هەر کە دایکی، یان یەکێکی دی بەسەریدا دەچێتو واملی تێە مارێکی لەدەستەو بە سەرەکەی وەك ملاك ماستی پێدەخوات.

ماری فەقیر ئەوەندەی ماست پێخووابوو تا تۆپی بوو.

٥-سەعات چەندە:

منو مەلا موحەمەدی دەروێش عەزیزو مەلا موحەمەدی حاجی قادر، لەگەڵ ئەو خوالێخۆشبووانە: ((مەلا عەلیو موحەمەدی مام ڕەحمان))، هەموویان خەڵکی گوندی ((لاوەر)) بوون. تەنیا من نەبێت بە سواری گوێدرێژ لە گوندی ((چەغەمیرە)) دەچووینە گوندی لاوەر. هەموومان فەقێ بووینو تازە هەڵدەهاتین. تەنیا موحەمەدی مام ڕەحمان لەنێوانماندا نەخوێندەوارو خاوەن ژنو منداڵ. پیاوێکی هێمنو قسە خۆشو دەم بەپێکەنین. ئێمەی فەقێ، بەکوڕی دەشیاین، سەت قسەمان پێ بگوتبووایە ڕووی هەرگیز گرژ نەدەکرد.

گوێدرێژی هەموومان نێرەکەر بوو. کەچی هی ئەو ماکەربوو. لەپێشەوە دەڕۆیشت. مەلا عەلیی ڕەحمەتی مرۆڤێکی قسە زۆر خۆش‌و سوحبەتچی بوو. بەزەردەخەنەوە گوتی:

— ئەرێ کاك موحەمەد سەعات چەندە؟.

سەعاتی نەبوو.. و زانی مەبەستی پاشەڵی ماکەرەکەیەو بە ڕوویەکی گەش‌و عوبابەوە گوتی:

— لۆ من زەحمەتە بێمە خوارێ‌و پێت بڵێم،دیسان سوار ببمەوە، کەچی بەرامبەر تۆیەو ببەوەکیلی من‌و پێشم بڵێ چەندە.

**٦-سەگبابی:**

لەگەرمەی شەعب شەعبانێیساڵی ((١٩٥٩))دا حیزبی شیوعی ((نەقابەی کرێکار))انی دامەزراندو بەدەیان کرێکار، بەشەوقەوە بەشداریان کرد.

ڕۆژێك کرێکارێکی حیزبی گۆڕین لەگەڵ کرێکارێکی پارتی دیموکراتی کوردستاندا بەشەڕدێت‌و پێیدەڵێت:

— سەگبابی بێ نەقابە.

**٧-سەگ‌و ڕێوی:**

یەکێك لە ئاوایی بێستانی دێمی هەبوو: ((ناوەکەیم لەیاد نەماوە)). تەڵەی لەنێو بێستانەکە دادەنێتەوە. کاتی ڕۆژ ئاوا ڕێوییەك پێوە دەبێت‌و دایە من.

پەتێکم لەمن کرد و هێنامەوە ئاوایی. بەدزی لەکلکی ((سە))ی ماڵی ئاغام خست. سەگێکی زۆر فەقیرو خەواڵۆ‌و ترسنۆك بوو. هەرکە

ڕێوییەکەی دیت تۆقیو یەکسەر بەقوڕ قوڕ تێیتەقاند. چ تێتەقانێك مەگەر هەر خوا بزانێت.

ڕێوییەکە دووسێ هەنگاو لەگەڵی ڕۆیشتو پاشدان سەگەکە بەهێزترو پتر دەبەزی، توانای نەماو بووە ((کوچکوچە)). چەند کۆڵانی کرد. قوڕەشی هەردەهات لە هەوەڵەوە هەتا هێزی لەبەر مابوو دەیگوت ((عەو،عەو،عەو)) هەرکە هیلاك بوو دیگوت: ((هە،هە،هە)) کاکی نێوەش هەتا شلو کوت بووم لە دوایان بووم.

پاشدان سەگەکە سەری بۆناو ئاقار هەڵگرت.

بۆ بەیانی وام دێتەوە خەیاڵ، تەواو لەبیرم نەماوە: سەگەکە لەبەر ترسو شەکەتیو ڕێوییەکەش ئەملاو ئەولای لەبەر خشین سەر زەوی پێستەو گۆشتی پێوە نەمابوو فەراقی حنتەیان لەبەر بڕابوو.

**٨-سەن ئۆسردو مەن دنمادم:**

لە گوندەکەی خۆم: ((مورتکە گەورە)) بەڕێوەبەری قوتابخانە بووم. لە دوای بەیانی ((١١/ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠))دا قوتابخانەی کچان لە گوندەکەمان کراوەو چەند مامۆستای ئافرەتی خەڵکی شاری هەولێریان دامەزراندو ڕۆژانە هاتووچۆیان دەکرد.

ڕۆژێك دایکمم لەگەڵیان ناردە شاری هەولێر.

لەبەر ئەوە جلوبەرگی ئافرەتانی دەشتی هەولێری لەبەر دابوو: ((کراسی زۆر شۆڕو نوشتاوەو کڵاوو دەسرۆك)) لە نێو سەیارەکەدا مامۆستاکان، بە تورکی هێرشی دەکەنە سەرو دەڵێن:

— کوڕی بەڕێوەبەری قوتابخانەیەو بەخۆش ئەوها دواکەوتوو.و نەزانە.

ئەویش لەبەر ئەوە لەنێو قەڵاتی شاری هەولێر گەورە بوو بوو تـوورکی دەزانی و دەنگ ناکات.

ئەوانیش هەتا دەگەنە ناوشار هـەر لەسـەر هێرشـەکە بـەردەوام دەبـن دایکم پێش دابەزینی پێیان دەڵێت:

—سەن ئۆسردو من دنمادم.

سەنەن وەیەمەن بلمادم.

واتـە: ((تـۆ کـڕت کـرد دەنگـم نـەکرد. لاتـان وا بـوو نـەمزانیوە)) مامۆستاکان هۆپێکیان زانیو لێکرا لە حریتەیاندا.

**٩-سندان لە ژنی من بدات:**

دوو پیاو یەکێکیان سعوودیو ئـەویتر لوبنـانی لەشـاری ((لەنـدەن)) ژنەکانیان لێدادەبڕێت و گوتیان:

—با هەریەکەمان بەلایەکدا بچێت.

سعودییە کە گوتی:

—پێوستە ئەگەر دیتمانەوە بیانناسین، هەر یەکەمان وەسفی ژنی خۆی بۆ یەکتر بکات.

لوبنانییەکە گوتی:

—ژنی من سوورو سپیو چاو گەورەو شینو قژمێشە کـراو.و سـینگی ڕووتەو تا ناوەڕاستی مەمکـەکانی دیـارنو تەنوورەیـەکی ڕەشـی کـورتی لەبەردایە، هەتا نیوەی سمتە خڕوگۆشتنە سپییەکانی بەدەرەوەن.

سعوودییەکە هەرکـە وەسـفەکەی بیسـت، ژنەکـەی خۆشـی سـەرتاپا ڕەشپۆشەو پیستەشی ڕەش گوتی:

—سندان لە ژنی من بدات، باجاریّ لەهی تۆ بگەڕێین.

**١٠-سوختەو کارەکەرێك:**

ڕۆژێك فەقێیەکی ((سوختە))، بۆ ڕاتبە دەچێتە بەردەرگای ماڵی ئاغای گوندێك و دەڵێت: ((ڕاتبە ڕەحمەتو لیّبیّت)).

کارەکەری ماڵەکە نانی بۆ دەهێنێتو ناداتە دەستیو بۆی تێهەڵدەدات.

فەقێکەش لەدڵی گران دەبێتو بە توورەیی یەوە دەڵێت:

—دایکم نان لۆ سەگ تێهەڵدەدرێت.

ئەویش لەکارەکەرییەکەی زۆر بێزار دەبێت:

—من و تۆ لەبەر ئەوە بەدەستو قامی خۆمان ناژین فەرقمان چییە لەگەڵ سەیان.

فەقێش دەڵێت:

—من فەرقم هەیە لەگەڵ جەنابت.

بەهەڵچوونەوە دەڵێت:

—هیچ فەرقت نییە.

فەقێ بۆ ئەوەی پێی بسەلمێنێت، کە فەرقی هەیە دەڵێت:

—سەرم بەسەرت. چاوم بەچاوت. دەوم بەدەوت. سینگم بەسینگت. زگم بە زگت. چشتەکەم بە چشتەکەتو دوو گونیشم زێدە.

**١١- سوورانە:**

لەو دێهاتانەی ئاغا نشینی دەشتی هەولێر ئەگەر کابرایەك کیژی خۆی بە مێرد بدابووایە، دەبووایە ماڵی زاوا ئاغایان ڕازی بکردبووایە. ئەگەرنا ئاغاکە نەیدەهێشت بووکەکەی ببەن.

هێندەجار ((شەشاگر))بوو. هێندە جاریش ((٣٠))دینار پارە. ئەو پارەیەش ئەوسا گەلێك زۆر بوو. ئەمە ((سوورانە))ی ناوبوو. واتە حەقی خوێن ڕشتنی دامێنی بووکەکە بوو.

ئەمە هەموو ئاغایەك وەری نەدەگرت.

**١٢- سونەتی موئەککەدە:**

کابرایەکی خەلکی ئاوایی ((چەغەمیرە))، ((ناوهێنانی هەموار نییە)) ڕۆژێك بەمەلای ڕەش دەلێت:

— من سونەتی موئەککەدە جێ بەجێ دەکەم:((کیژی خۆم لۆ خۆم بەژن دەدەم)).

گوێدرێژێکیشی هەبوو بیست و چوار سەعات بەرەللای دەکردو زەرەرو زیانی بەبەرهەمی کشتوکاڵی خەلکەکەی دەگەیاند.

مەلای ڕەشیش دەلێت:

— ئەو سونەتە موئەککەدەی مەکەو.واجبێك هەیە لە سونەت لەپێشترە بیکە.

— ئەو.واجبەی دەلێت: چییە؟.

— کوێدرێژەکەت تێر بکەو بیبەستەوە.

**١٣- سیان و مامەسێنی:**

دوو عەرەب میوانی دیوەخانی خوالێخۆشبوو:((هادی ئاغا))ی گوندی ((سەربەشاخ)) دەبن. ئێوارەنانیان دەدەنێ و کاتی نووستن پێخەفەیان بۆ دەبەن.

شەو ڕاشکاو نۆبەتداری دیوەخان گوێی لە شرپەو هۆڕێك دەبێت لە ژووری دیوەخان. دەبینێت هەر دوو عەرەب ئەوەندەیان بەعەگالان لەیەکتر داوە تا هەردووکیان شراربوو بوون.

هەرچۆنێك بوو نۆبەتدارەکە لەیەکیان دەکاتەوە و دەڵێت:

—پێم ناڵێن: ئەو شەڕەتان لەسەر چییە!.

یەکێکیان زار هەڵدەهێنێت و دەڵێت:

—من دەڵێم: عەشیرەتی سیانان ناندەرو پیاوترن، کەچی ئەو مەلعوونە دەڵێت:

—نەخێر مامەسێنی ناندەرو پیاوترن.

**١٤-سێ قوتابی:**

سێ قوتابی عەرەب بەیەکەوە لە بەغدایان دەخوێند. بڕیاریاندا لە کۆی هاویندا سەردانی شاری هەولێرو هاوینە هەوارەکانی بکەن.

یەکێکیان خەڵکی بەسرەبوو.و گوتی:

—من باشترین خورمای بەسرە لەگەڵ خۆم دەهێنم. دووەمیان بەغدایی بوو.. و گوتی:

—منیش کوبەی تایبەتی ماڵی خۆمان دەهێنم.

سێیەمەکەیان خەڵکی موسل بوو.و گوتی:

—منیش برایەکم هەیە لەگەڵ خۆمی دەهێنم.

## پیتی - ش -

**١-شتاقە لینگت عەردی ناگرێت:**

ئـافرەتێکی باڵابـەرزو زۆر جـوانو قـۆزو بـە کەشـخە مێردەکـەی زۆر ناپووتو پوخەلە دەبێت:

پیاوێکی بەسیماو کۆك وەبەرگوێی هەڵدەداتو دەڵێت:

—سەت حەیفو مخابن ئەتووڕێکی پەری ژنی ئەو قولە مەیتەرە بیت!.

ئافرەتەکەش خۆی لە گورە ناباتو دەڵێت:

—من پێی ڕازیمە.

کابرا دەڵێت:

—چ مێردت هەیە هەتا پێی ڕازی بیت!.

ئەویش بە پێکەنینەوە دەڵێت:

—ئەوەی لە پێشەوەی منی نایە، لە پاشـەوەی جـەنابت بنێـت شـتاقە لینگت عەردی ناگرێت.

## ٢-شەریفە کوێر:

شەریفەکوێر پیاوێك بووکاتی خۆی بەهۆی خوریکەوە هەردوو چاوی کوێر بوو بوو. لەشاری هەولێر دادەنیشت. ناوە ناوە بۆ یارمەتیدان دەهاتە گوندەکەمان. بە ((فیتە))و ((کەسكو سۆر)) شێتو هار دەبوو.

هەرجارێك بهات بووایە من فیتەم بۆ لێدەدا.

دەیگوت:

—تۆ کێیت؟.

منیش جارێك دەنگم وەك دەنگی خوالێخۆشبوو ((مەلا عەباس))ی ((برایم کارەوان)) لێدەکردو دەمگوت: ((عەباسی برایم کاراوانم))، جاری دووەم دەنگم وەك دەنگی خوالێخۆشبوو ((مەلا ئەمین))ی ((حاجی تەها)) لێدەکردو دەمگوت: ((ئەمینی حاجی تەهام)). هەردووکیان وەك من فەقێ بوون.

ئەویش تا دەنگی تێدا بوو دەیگوت:

—هەی دایکی برایم کارەوانو حاجی تەهات بگێم.

شەوێك لە گوندەکەمان ماوەو لێفێکیان دایە لە مزگەفت پێ بنووێت. بەری لێفەکە قوماشێکی لووس بوو. خۆی ڕووتو قووت دەکاتەوەو لایە لووسەکەی لەخۆی لوول دەداتو لەم سەری مزگەوت بەغار دەچێتە ئەو سەرو دەڵێت: ((ئۆخەی.... ئۆخەی..... ئۆخەی.....)) ناوی کیژی ئەو ماڵە دەهێنێت کە لێفەکەیان دابووێ.

خەڵکەکە هەر کەزانیان بە پلووکە بەردانو بە ڕووتی دەری دەکەن.

پاشدان لە دەرەوەی ئاوایی زۆر دەگرییێت. خوالێخۆشبوو ((مام حاجی تەها)) جوامێرێکی ئاوایی بوو شمەکەکانی بۆ دەبات. لەوساکەوە بڕای بڕ تخوونی ئاوایی نەکەوتەوە.

٣-شەمشەمە کوێرە:

هەرچی زندەوەری سەرگۆی زەوی بوو داوایان لە یەزدانی مەزن کرد لە دنیادا ئەوسێ شتانە لە جێگەی خۆیان راگرێت.

١- ڕۆژ=خۆر.

٢- ئاو.

٣- با.

تەنیا شەمشەمە کوێرە نەبێت گوتی:

یەکەم: قوربان ئەگەر ڕۆژ لە شوێنی خۆی راگریت هەرچی زندەوەرە دەسووتێت.

دووەم: ئەگەر ئاو.. ڕاگریت زندەوەر لە تینوان دەخنکێت.

سێیەم: ئەگەر ((با))ش بووەستێنیت ژیان لەسەر گۆی زەوی نامێنێت.

ڕۆژ زۆر پێ تێکدەچێتو دەڵێت:

—لەتۆڵەدا شەرتە شەمشەمە کوێرەی بسووتێنم.

شەمشەمە کوێرە لە ترسی خۆر لەوساکەوە بەشەو نەبێت نایەتە دەرەوە.

ئاو دەڵێت:

—شەرتە ئەگەر نزیکی من بکەویت بیخەمە دەروونی خۆمەوە.

شەمشەمە کوێرە لەو ڕۆژەوە ناوێرێت ئاو بخواتەوە.

با دەڵێت:

— هەر بێتە دەرەوە پەڕوباڵی تێکدەشکێنم.

شەمشەمە کوێرە: لەو ساتەوە پەڕوباڵی بەخۆیەوە نەهێشت تاکو ((با))تێکی بشکێنێت.

**٤-شەوتا:**

هێندە نەخۆشی لە زەمانی زوو هەبوو: شەوان نەخۆشەکە ((تا))ی دەهاتیو بە ڕۆژ بەری دەدا.

یەك دوو خزمو کەسی نەخۆشەکە شەو لە نێو ئاوایی دا دەگەڕانو دەچوونە نزیك ئەومالەی پیاوەکەی دوو ژنی هەبوو.. بەدەنگی حێلەوە دەیانگوت:

— شەوتا، شەوتا، شەوتا.

بەشەو دەگری تا، بە ڕۆژ بەر دەدا

ماخۆی چوار چاو چ دەرمان دەدا.

((ماخۆی چوار چاو=پیاوی خاوەن دوو ژن)).

پاش چەند جار بانگ ڕاهێشتن خاوەن دوو ژنەکە دەهاتە جەواب. ئەگەر ماڵی نەخۆشەکە دەوڵەمەند بووایە دەیگوت:

— گۆشت بەرخ، یان گۆشت کاوڕ.

ئەگەرنا دەیگوت:

— گۆشت فروج.

دەبووایە قسەکەی جێ بەجێ بکرابووایە.

گوایا، بەخواردنی گۆشتەکە تایەکە بەریدەدات..

..........................................................

ئەم تەرزەشی هاتووە: ((خودانی چوارچاو)).

**٥-شەوەگان:**

پیاوێك ژنەکەی ئەمرێ خوای بەجێدێنێتو دەست بـەگریان دەکـاتو زۆریان لەگەڵ هەوڵ دا بەهیچ جۆرێك کڕنەدەبووەوە.

ئافرەتێکی دراوسێی بۆ ئەوەی واز لە گریانە بێنێت پێیدەڵێت:

—عەمرت نەمێنێت پیـاو ئـەو هـەموو گریانـەت لۆشـەوە گانێکـە. بیبڕەوە لەمەودوا هەموو شەو لەجیاتی دووگانت دەدەمێ.

**٦-شەوێك:**

بێوەمێردێکی حەفتا ساڵی کوڕی پارەی لـە دەرەوە بۆنـاردەوەو هەنـدە بزنیشی هەبوو فرۆشتنی. لەکاتی گرانییەکە شەست حەفتا هەزار دینـاری سویسری خەرج کرد هەتا ژنی هێنا. شەو بە حاڵە حاڵو جرە جڕ یـەکێکی پێدەکرێت.

کابرایەکی گەنجی بەدینی ڕیشداری دراوسێی پێیگوت:

—مام حەمەد بەو گرانییـە ئەگـەر ئـەو پـارە زۆرەت بدابووایـە مـن شەوێك لەگەڵت دەنووستم.

**٧-شەهادەی هەردووکتان:**

دوو دختۆر ((پزیشك)) پیاوێك لەپاڵ دیوارێك دەبینن کووڕ بووەتـەوە یەکێکیان دەڵێت:

— ئەوە فەقەرات ئاوای کوور کردووەتەوە.

ئەویتر دەڵێت:

— نەخێر کەرخی مایەسیرییە.

کابراش دەڵێت:

— شەهادەی هەردووکتان بەقوونم. من گووم دێتو خواخوامە بەخۆم دانەکەم هەتا بەرچاوم چۆڵ دەبێت.

**٨-شەیتان پێیکردم:**

کابرایەك لەسەرکاری قووندان گیرابوو.. و حاکم لێیپرسی:

— کورە ئەوکارە قۆڕەت بۆ کردووە؟.

ئەویش دەڵێت:

— قوربان شەیتان پێیکردم.

حاکم ئەوسا دەڵێت:

— شەیتان بێزی ئەهات سوجدە بۆ ئادەم ببات چۆن گەوادی بۆ قوون درایەکی وەك تۆ دەکات.

**٩-شێخو مەلایەك:**

شێخێك لە دەڤەری ڕواندزەوە: ((ئاوهێنانی هەموار نییە)). ڕۆژێك لە نێو کۆمەڵە خەڵکێکی زۆرەوە تووشی ((مەلایەك))ی لای ڕواندز دەبێت. لەبەر ئەوە مەلایەکە گوایا تەلاقی کەوتەی چاك دەکردەوە شێخەکە ویستی لە کۆبوونەوەکەدا ئیهانەی بکاتو پێیگوت:

— مەلا کێرت چۆنە؟.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

– یا شێخ ئەگەر چەور بکرێت بە قوونی جەنابتەوە دەچێت.

شێخ لە شروان شێتو هار دەبێت، بەڵام دەسەڵاتی هیچی نابێت. لەجیاتی وەڵامی ویستی بەلایەکی دیکەوە ڕیسوای بکاتو گوتی:

– مەلا ئەدی قوونت کووە؟.

بەزەردەخەنەی تەڵخەوە گوتی:

– یاشێخ قوونیشم چ عەیبی نییەو لۆ دەوی جەنابت بە کەڵك دێت.

**١٠-شێخی سەعدی:**

من منداڵ بووم ئەمەم لە حوجرەی فەقێیانم بەم چەشنە بیستووە:

– خوا لێخۆشبوو شێخی سەعدی سەردەمایەك لە دنیادا دەگەڕا. واتە ((سەیاح)) بوو.

بچوو بووایە هەر شوێنێك کارێکی دەکرد تاکو پێ بژیت، نەك موحتاجی دەستی خەڵك.

ڕۆژێك لەشارێکدا ((ملاك)) =((کەوچك)) ان دەفرۆشێت.

کوڕی گەورەی شارەکە هەرکە دەیبینێت ئەو پیاوە دیمەن جوانو زەریفە کەوچکان دەفرۆشێت. ئەمەش بۆ ئەو هەرگیز شیاو نییە چووەلای و پێیگوت:

– ڕۆژانە چەندت لە ملاك فرۆشتن دەستدەکەوێت؟.

ئەویش پارەیەکی کەمی ئەوسەردەما، دەڵێت:

کورە پێیدەڵێت:

– من دە ئەوەندە پارەت دەدەمێ وەرە لە دواوە گونم بۆ هەڵگرە.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

— بۆ تۆ جوان نییە من بەکوورە کــوورِ لــە دواوەت بــڕۆم و گونـت بـۆ هەڵگرم. بەس شتێکی ئاسانتر هەیە گونت بۆ هەڵگرێت.

کورەش دەڵێت:

— چییە؟.

— یەك لەو مەلاکانە بکرەو کلکی لە قوونی خـۆت بـنێ‌و سەرەکەشـی گونتی باوێ ناوی..

**١١-شێخی شێراوە:**

لە گوندی شێراوەی دەشتی هەولێر. زەمانی زوو شێخێك پەیدا دەبێت.

خەڵکەکە باوەڕیان زۆر بەشێخاتییەکەی دەبێت‌و یەکجار زۆر .. ڕێـزی دەگرن‌و بە هەموو توانایەکیانەوە خزمەتی دەکەن.

لەناوچەکەش هەرکە دەگوترا ((شێخی شێراوە)) دەبڕایەوە.

پـاش چـەند سـاڵان شـێخ پارەیـەکی یـەکجار زۆر پەیـدا دەکـات‌و بەخەڵکەکەی دەڵێت:

— غەریبـی خزم‌و کەس‌و نیشـتمانەکەی خـۆم دەکەمـەوەو دەمـەوێت بچمەوە.

خەڵکەکە زۆر پێ دڵگیر دەبن، بەڵام دەسـەڵاتی ڕەتدانـەوەی فـەرمانی شێخیان نابێت و گەورەو گچکە بۆی لە برازۆ دەدەن.

پیاوەکان وەگەڵی دەکەون هـەتا دەگەنـە سـەر ((زێ))ی ((کەلـەکی یاسین ئاغا)).

ژنیەکە زۆر هاتبوو کەس نەیدەوێرا لێی بدات. کەچی شێخ مەلاوانێکی مەعلان دەبێت و بەشەکی بەریەوە مل لە ڕووبارەکە دەنێت‌و دەپەڕێتەوە.

خەڵکەکە پەڕینەوەکەیان بەکەرامەت خەملاندو لەزگ بوو زمانیان تێ بگێڕن، کەچی شێخ سەرنج کێشیان بوو.و بەدەنگی بەرزەوە وا بانگیان دەکات:

— هۆ...موسڵمانە خەشیمەکان هۆ..... تڕادن ئەوها دەبێت ئەوها. من موسڵمان نیمە نا . مەسیحیم مەسیحی . بۆ شاهیدیش.....

لەگەڵ عەورەت ڕووت کردنیدا دەڵێت:

— چاك سەیر کەن کێرم نەبڕاوە، نا.

**١٢-شێخی ماویلیان:**

خوالێخۆشبوو: ((مەلا عومەر))ی گوندی ((چل هەوێزە))ی ناوچەی کەندێناوە. دۆستی گیانی بەگیانی یەکتر بووین. ڕۆژێك لە ((لەحاجی ئۆمەران)) لە ژێر ڕەشماڵی بارەگای بارزانیدا خەڵکێکی زۆر دانیشتبوون. سۆفییەکی شێخی ((ماویلیان)) لەوێ دەبێت‌و مەلا عومەر لێیدەپرسێت:

— ڕاستە جەنابی شێخ ((٤٠)) چل ژنی هێناوە؟.

سۆفییەکە دەڵێت:

— بەڵێ ڕاستە.

— ماچل ژن بەدینی ئیسلام درووستە؟.

— هەرچل ژن بەیەکەوەی لەلا نەبووە.

— ئەدی؟.

— هەرجارێ چواری لابووەو یەکێکی تەڵاقداوەو یەکێکی تری هێناوە.

مەلا عومەر بەسەر سامییەوە دەڵێت:

— ئەوجا بۆ.. وای کردووە.

— هەتا ژنەکان بچنە بەهەشتێ.

یەکسەر دەڵێت:

— جەنابی شێخ لە ژیاندا ماوە؟.

— نەخێر نەماوە.

بەهەردوو دەستان لە چۆکی خۆی دەدات و دەڵێت:

-ئاخ.. ئاخ.. لەوخەسارەتەی . خۆزگە بمابووایە منیشی دەستێك بگابووایە بۆ خۆم دەچوومە بەهەشت.

## پیتی - ع -

**١-عادەتی بووکان تێکنادەم:**

بێوەژنێك نۆ مێردی کردبوو. ڕۆژێك دەورو دراوسێ دەبینن چەند کـەس هاتوونە بێوەژنی بە بووك ببەن.

بێوەژن لەکاتی بەڕێ کردنیدا دەست بەگریان دەکات.

خەڵکەکە بە حەیرمانەوە پێیدەڵێت:

—تۆ ئەوە دەیەمین مێردە پێمان ناڵێیت: ئەو ڤنگە ڤنگە لە چییە؟.

ئەویش دەڵێت:

—وەللا من قەت عادەتی بووکان تێکنادەم.

**٢-عەگال سوودی هەیە:**

من لە ((١٠-١٢-١٩٦٠)) هەتا ئەیلوولی ساڵی ((١٩٦٣))دا، لە ((عەتیرە))، گوندێکی عەرەبـی جبووری بوو، مامۆستا بووم.

لەدڵی خۆمدا دەمگوت: ((

—ئەو عەگالەی سەریان زێدەیە)) .

هەتا ڕۆژێك دیـتم دووپیـاوی ئـاوایی بەشـەڕهاتن. هەریەکـەیان بـە عەگالان وەرگەڕا ئەویتر .

هــەر عــەگالێکیان لەیــەکتر دەدا وەك قامچــی، لــە دوورەوە زرچــەی دەهات‌و جێگەکەی دەلحاز شین‌و مۆر هەڵدەگەڕا.

لەو ڕۆژەوە بۆ خەڵکەکەم سەلماندو گوتم:

— لەو شەڕەدا زانیم: عەگال سوودی هەیە.

**٣-عەگالی:**

کابرایەکی عەرەبــی دەشتەکی، ڕۆژێك لە پشتەوە لۆرییەك سواردەبێت بۆ شار. هەرکە دەگاتە شارەکە بەدەست لەبۆدیی لۆرییەکە دەدات ڕاگرێت.

هەرکە ڕادەگرێت‌و عــەرەب خــۆی بــەدەرگاوە شــۆڕ دەکاتــەوەو لەگــەڵ پێگەیاندنە عەردی عەگالەکــەی بــە قولابـــی پشـــتەوەی لۆرییەکــە گــیر دەبێـــت. شــۆفێرەکە هەســـت پێناکـــات و دەڕوات. عـــەرەب لـــە ســـوێی عەگالەکەی تەنگەتاو دەکەوتە دوای‌و پڕ بەزار لە گەرمەی غارو بەدەســت هەڵتەکانەوە دەڵێت:

— عەگالی چەلب بللۆری.

— عەگالی چەلب بللۆری.

— عەگالی چەلب بللۆری.

**٤-عەلی جومعانە:**

زەمانی زوو من لەناو فــەقێیان بــووم پیــاوێکی نەخوێنــدەوار هــەبوو تۆزێك عەقڵی تەواو نــەبوو ((عــەلی جومعانــە))ی نــاوبوو. ســاڵ دوازدە مانگ دەڕۆژەی دەکردو دەیگوت: ((

— لە جومعانە دەگەڕێم)) .

بۆیە ((جومعانە))ی بەدواکەوت.

وشەی ((جومعانە)) تایبەت بوو بەیارمەتیدانی فەقێیان.

کاتی خۆی چەند فەقێیەك لە گوندێکیان دەخوێند. سێ ژەمە چایەیان لێدەناو یارمەتی گوندەکەیان بەشی نەدەکرد. چەند ((موستەعید))ێك، ئەوانەی لەدوا پلەی خوێندن دا بوون=((کۆلێژی ئێستا))، لە ڕۆژی جومعەدا دەچوونە گوندەکانی دەوروبەریان، بەمەرجێك فەقێی لێنەبووبێت، ئەگەرنا نەدەچوون. لەکاتی نوێژکردندا بەخەڵکەکەیان ڕادەگەیاند. ئەوانیش بەقەدەر توانا یارمەتییان دەدان.

ئابەم یارمەتییە، کەلە ڕۆژانی جومعان دەبوو دەگوترا: ((جومعانە)).

کاك ((عەلی)) چەمەریش ئەو ناوەی لە دەرۆزەکردنەکەی خۆی نابوو. هەر جارێ کەبهات بووایە بەسەرهاتو سەربردەیەکی قۆڕی بۆ فەقێیان دەگێڕاوە.

من تەنیا ئەمەم لەبیر ماوە.

گوتی:((هەشت نۆ دە زەلام دەگەنە ڕووبارێکی زۆر گەورە. بەهیچ شێوەیەك نەیاندەتوانی لێی بپەڕنەوە. دوای تەکبیرو مشوور خواردنێکی زۆرەوە وارێککەوتن: هەریەکەیان کێری لەنێو قوونی ئەویدیکە ناو ملیان لە ڕووبارەکەنا.

ئەوەی دوایی بەدەنگێکی حێلەوە دەیگوتە ئەوەی پێشەوە:

—کوڕە هێواش. کوڕە هێواش. کوڕە هێواش.

ئەویش دەیگوت: ((

—کوڕە چ هێواش هێواشتە ئەمن وا لەزگە چاوانم بتۆقێن)).

### ٥-عەلی شیش:

پایە بەرز خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا سەعیدی ((باشتەپە)) پیاوێکی قسە خۆشو نوکتەچی بوو.

خوالێخۆشبوو مەلا ((عەلی))ی کوڕی ئامۆزایەکی ناو ((جەوهەر))ی دەبێت ناوە ناوە بەگاڵتە پێدەڵێت:

- ((جەوهەر)) ئەلفێك بۆ.واوەکەی ناوت زێدە بکەین دەبێتە ((جەواهر)). ئەمەش ناوی ژنانە.

جەوهەر هەراسان دەبێتو دەچێتە لای مامۆستای گۆڕینو پێیدەڵێت:

- مامە بۆ بەعەلی ناڵێت هەر پێمدەڵێت:

- جەوهەر ئەلفێك بۆ ناوەکەت زێدە بکەین دەبێتە ((جواهر))و ئەمەش ناوی ژنانە.

مامۆستاش دەڵێت:

- تۆش بڕۆ شیشەیەك لەپاشەڵی عەلی راکە دەبێتە ((عەلی شیش)).

## پیتی - غ -

### ١-غایەتم لە سەگێکتدا:

سەرۆك عەشیرەتێك، بە ئۆتۆمبێل لە پیاوێکی پیردەدات و هەتا دەیگەیێننە نەخۆشخانە پیاوەکە نەمری خوا بە جێیدەهێنێت.

بەدوای کورەکەی دەنێرن. کەچاوی بەتەرمی باوکی دەکەوێت شێت و هار دەبێت و پشکی لەبەر خۆیەوە دەهێنا. پاشدان هەرکە غەنیمە کەی ناسی دەلحاز کەیفسازی دایدەگرێت و بە گوراح خۆشییەوە ڕووی تێدەکات و دەڵێت:

– قوربان خەم مەخۆ غایەتم لەسگێکت دا.

## پیتی ـ ف ـ

### ١-فرۆکەوانی ئێرانی:

فڕۆکەوانی ئێرانی لەکاتی شەڕەکەدا لە ئاسمانی باشووری کوردستان دەرکەوت و گەیشتە کێوی گۆییژە گوتی:

— ئەوە شاری سلێمانی یە!.

هەرکە ئاگری شەریکەی نەفتی دیت گوتی:

— ئەوە شاری کەرکووکە.

هەرکە چاوی بەقەلاّو منارە کەوت گوتی:

— ئەوە شاری هەولێرە.

هێشتا مابوو بگاتە شاری موسل لە دوورەوە گوتی:

— ئەوە شاری موسلە.

پێیانگوت:

— چۆن دەزانی؟.

— کنێکنێسیان لەسەریان هەڵخستووە.

**٢-فەقێنە فەقێ:**

سێ چوار فەقێ لە وەرزی بەهارداو ڕۆژێکی سامالّو خۆشدا، بەڕێدا دەڕۆیشتن. لەسەر لێواری کەندێك چوار پێنج ژنە کۆلکەری ڕووتو قووت دەبینن. فەقێکان لەشەرمان پشتیان تێدەکەنو بۆ ئەوەی ئافرەتەکان ئاگاداربنو خۆیان داپۆشن دەست بە ((ئحم ئحم)) دەکەن.

یەك لە ژنەکان زوو هەست دەکاتو دەڵێت:

— کچێ خۆتان داپۆشن پیاو هاتن:

یەکێکی تریان بە ڕووتی قیت دەبێتەوەو دەیان بینێتو دەڵێت:

— کچێ پیاو نینە ، فەقێنەفەقێ.

**٣-فەقێ هەتا ئەوەم هەبێت:**

ڕۆژێك فەقێیەکی دەشتی هەولێر، بەدیەن زۆر سوورو سپیو کۆك دەبێت دەیەوێت بۆ دیوی ڕۆژهەلاّتی کوردستان بچێت.لە ڕێگادا تووشی ئافرەتێکی زۆر جوانو قۆز دەبێتو پێیدەڵێت:

— دایە تۆ بەتەنیا لەو ڕێگایە ناترسیێت؟.

ئەویش بێ پەردە دەست دەخاتە سەر عەورەتی خۆیو دەڵێت:

— فەقێ من هەتا ئەوەم هەبێت لەکێ دەترسێم.

ئەویش لەشەرمان هەتا دەگەنە ئاوەدانی لەفزی دیکەی لەگەڵ ناگێڕێت.

**٤-فەقێی تووخۆرە:**

هەندێك لە فەقێیانی دەشتی هەولێر فێر بوو بوون، کەدنیا گەرم دادەهات دەچوونە ناوچەی خۆشناوەتی دەیاخوێند.

لەبەر ئەوە ڕێگاکە دوور بوو، مەسرەفیشی دەویست هەر لە هەوەڵەوە کەڵو پەلەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبرد.

بەپێچەوانەی فەقێیانی دەشتی هەولێر هەتا جێی نەگرتبووایە کەڵو پەلی نەدەبرد.

هەتا دنیا سارد دەبوو ئەوجا دەگەڕانەوە.

خەڵکی خۆشناوەتی بەم جۆرە فەقێیانەیان دەگوت:

— فەقێی تووخۆرە.

واتەهەر بۆ توو خواردنو ڕابوارد دێن، نەك بۆ خوێندن.

## پیتی - ق -

**١-قاچپەخانە:**

پیاوێکی خۆشناو لە زەمانی زوو دەچێتە شاری هەولێر هێندە کەڵو پەلی ماڵەوەو گوێدرێژێك بکڕێت.

دوای کڕینی کەڵو پەلە پێویستەکانی پارەی ئەوەندە لانامێنێت نێرە کەرێکی پێ بکڕێت. ئەوساش سەیارە نەبوو. ناچار، بۆ ئەوەی کەڵو پەلەکەی پێ بباتەوە، پارەکەی لای مابوو، بەحاڵە حاڵ ماکەرێکی خراپی پێکڕاو بەرەو گوندەکەیان بووەوە. هێشتا ڕۆژمابوو ئاوا بێت گەیشتە نزیك گوندەکەی‌و بە ئەنقەست بۆ ئەوەی کەرەکەی نەبینەدرێت خۆی لە پەنایەکەوە بوارد.

ئێوارە وەختی نوێژی عیشا نێرەکەرەکانی ئاوایی بۆنی ماکەرەکەیان بۆ دەچێت لێکرا دەست بەزەڕە زەڕێکی وا دەکەن کە چ جار ئەوها نەبووەو هەرگیز کڕیش نەدەبوونەوە.

خەڵکەکە نەیاندەزانی مەسەلە چییەو لە دیوەخانی میرکۆ دەبنەوەو میر بە ڕوویان هەڵشاخاو گوتی:

— ئەرێ پێمناڵێن: ئەو هەموو زەڕە زەڕەی ئەو شۆکە چییە؟!.

هیچ کەس نەیدەزانی تا وەڵام بداتەوە. تەنیا برای کەر ماکەرێ ئێوارە ماکەرەکەی دیبوو.. و گوتی:

— چت لێ بشارمەوە میرم: حەمەدی برامەو ئاوایی یەکەی کردیتە قاجپەخانە.

**٢-قوزێ بزنێ:**

کوڕە جاحێلێکی گوندەکەمان شێتو چەپو چوێڕو زمان ناتەواو دەبێت.

کیژوکاری ئاوایی هەرجارێ بەئەنقەست دەورەیان دەداو دەیاندوواند. هەرکە پشتیان تێدەکرد هەتا لەسەر پشت دەکەوتن پێدەکەنین.

ڕۆژێك ئافرەتێك پێیاندەڵێت:

— ئەرێ ئێوە کە دەچنە لای ئەو کوڕە شێتەی بە چ پێدەکەنن.

ئەوانیش دەڵێن:

— بەقسەی شێتەکە. هەرجارێ ئێمە کە دەورەی دەدەین پێماندەڵێت: ((

— قوزێ بزنێ)) .

ئافرەتەکە ئەوسا پێیان شێن دەبێتەوەو دەڵێت:

— کچێ ئەنگۆ خراپ لێحاڵیبوونەو ئەو مەبەستەی نییە.

— ئەدی؟.

— دەڵێت: قوزتان بگێم.

ئەوسا کچەکان پەنجەی قاریان دەگەزنو لەو ڕۆژەوە لەجیاتی پێکەنین، بە ڕوویەکی دڕدۆنگەوە گەشکەیان پێدەگرت و زار جووە تفیان حەواڵە دەکرد.

**٣-قوم:**

ئەم خوالێخۆشبووانە ((مەلا رەشید لهێبان. مەلا حەمەدەمینی مام بایز. مەلا سابیری مام شێخە)) میوانی حوجرەی گوندی ((لاوەر)) گوندێکە لەباکووری خۆرئاوای کێوی ((قەرەچۆغ)) دەبن. ئەوسا ((مەلا حەمەدەمینی برام و مەلا حەمەدەمینی کارەوان)) موستەعید دەبن.

مەلاش ئەوسا خوالێخۆشبوو مامۆستا ((مەلا سولێمان))ی ((شەریفە قیت)) دەبێت.

میوانەکان جغارە خۆر دەبن‌و توتنیان کەم لا دەبێت خانە خوێیەکانیش بەرێککەوت توتنیان لێ برابوو.. و ئێوارە لە توتنی میوانەکان جغارە دەکێشن. بۆ بەیانی توتنیان نامێنێت. مەلا سابیری مام شێخە لە ژیاندا یەکجار گوراح خۆش‌و نوکتە باز بوو رووی لە هاورێکانی دەکات و دەڵێت:

—خۆزیرینە ئێوارێ چەند جارم پێگوتن کورە بابڕۆین هەتا فەقێ‌و خەڵکی لاوەری قومیان لە کێرمان نەدا..وە

**٤-قوونت دەهاتە:**

ئەفەندییەک‌و مەلایەک لەسەر سووڕانی گۆی زەوی‌و نەسووڕانی دەبێتە کێشەیان.

ئەفەندییەکە دەڵێت:

—چۆن دەزانم خوا هەیە ئەوهاش دەزانم زەوی دەسوورێت.

مەلاش دەڵێت:

—منیش بەڵگەیەکی زۆر بەهێزم لایە کە زەوی ناسوورێت.

ئەفەندی دەڵێت:

— پێم ناڵێیت چییە!؟.

— ئەگەر بسوورابووایە هەنووکە قوونت دەهاتە سەر کێرم.

**٥-قوونتی پێ بسڕەوە:**

پیاوێك چەند ساڵ بوو دۆستێکی ئازیزی لێدابڕابوو. ڕۆژێك تووشی دەبێتو دووراو دوور لەجیاتی چاكو خۆشی دەربڕین پێیدەڵێت:

— ها.. کێرمردی کێرت چۆنە؟.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

— بووەتە پەڕۆ.و قوونتی پێ بسڕەوە.

**٦-قوونم:**

سەردەمایەکی زوو شێتێك لەشاری هەولێر هەبوو. هەرشاییو زەماوەندێك بگێڕدرابووایە ئەو دەلحاز حازر دەبوو.

ڕۆژێك پێیانگوت:

— چۆن هەموو جارێ دەزانیت زەماوەندو شایی یە؟.

گوتی:

— هەر شاییو زەماوەندێك دەست پێ بکات قوونم یەکسەر پتە پت دەکات.

**٧-قۆچی کەرو نانی مەلا:**

ڕۆژێك پیاوێك نەخۆش دەکەوێتو حەکیمی سەردەم دەچێتە لای و دەڵێت:

— تۆ بەدوو شتان چاك دەبیتەوە.

یەکەم: قۆچی کەر،، دووەم نانی ماڵی مەلا.

کابرای نەخۆش دەڵێت:

– لەگینە قۆچی کەر دەسکەوێت، بەڵام نانی ماڵی مەلا موستەحیلە.

## پیتی - ك -

**١-کارەبا گەیشتە قوونی من:**

کابرایەك چوار پێنج ساڵ هەوڵدەدات کارەبا بۆ گوندەکەیان ڕاکێشێت.
بەر پرسانی میری داواکەی پشت گوێ دەخەن.

کابرا تووشی ((مایەسیری)) دەبێتو دەچێتە لای دکتۆر.

دکتۆرەکە پێیدەڵێت:

- دەبێ بەکارەبا کەوی بکرێت.

کابرا ناچار لەبەر حەبرەیی خۆیەوە ڕازی دەبێت.

هەرکە دکتۆرەکە خەریکی پلاك گەرم کردن دەبێت نەخۆشەکە دەست بەپێکەنین دەکات.

دکتۆر پێیدەڵێت:

- بەچی پێدەکەنیت؟.

- کارەبا گەیشتە قوونی من هەرنەگەیشتە گوندەکەمان.

**٢-کەرگان:**

ڕۆژێك شوانێکی ئاوایی ((گردەشینە))ی ناوچە ((کەندیناوە)) نێوارە هەرکە لەبەر مەڕ گەڕاوەو بەخەڵکەکەی گوت:

—کەری فلانم دوور بە دووری لەنێو ئاقاردیت یەکێك دەعەمەلی دەهێنا.

پێیانگوت:

—چی لەبن پێی خۆیدا نابوو، یان ..نا..؟.

گوتی:

—دوور بوو..و لێم دیار نەبوو.

پێیانگوت:

—سبەینێ برۆ شوێنەکەی ئەگەر شتی لەبن پێی خۆیدا نابووخەڵکی گوندی ((دووشیوان))ە، ئەگەرنا ((مەلا کاغایی))یە.

**٣-کەریش بەگوێ دەناسم:**

کابرایەکی دۆستمان فیراری عەسکەری دەبێت. ئەمکە عەسکەرییەکەی بە نامانەت هێنا ماڵی ئێمە.

منیش ئێوارەیەك لەبەرم کردو هەرکە باوکم لە نوێژی مەغریب هاتەوە چووم دەستم ماچ کرد. لەبەر ئەوە دنیا تاریك بوو نەیناسیمو گوتی:

—بەخێر بێیت کوڕی باوکم.

هەرکە بەپێکەنین پشتم تێکرد ناسیمی.

گوتم:نەتناسیم.

گوتی:ـ ((هەرکە پشتت تێکردم گوێیەکانتم دیت ناسیتم. چونکە کەر بەگوێ دەناسم)).

**٤-کەی من ئەوەند کەم خۆر بوومە.**

ڕۆژێك کابرایەك دەچێتە لای مەلای گوندەکەیانو دەڵێت:

— مامۆستا ئەو شەو لەخەونمدا پتکە گوێکم خوارد.

مەلاش دەڵێت:

— پارەت دێتە دەست.

کابرا دەگەڕێتەوە و لە ڕێگادا لیرەیەك دەبینێتەوەو ئەوسا دەڵێت:

— تۆخوا من کەی ئەوەندە کەم خۆر بوومە.

**٥-کچیَ بیدیَ:**

خوالێخۆشبوو ((عومەرەکۆر)) پیاوێکی گوندی ((سەر گەڕان))ی ناوچەی کەندێناوە، چرچاوی تەواو نەبوو زۆر قسە خۆش و نوکتە باز بووە.

ڕۆژێك لەسێبەری مزگەوتی ئاوایی داوا لە پیاوێك دەکات:

— ((٥)) پێنج دینارم بەقەرد بدیَ.

ئەویش دەڵێت:

— چ پارەم لانییە، بڕۆ لەدایکی منداڵان وەرگرە.

ماڵی پیاوەکەش بەرامبەر مزگەوت دەبێت. عومەرە کۆر دەچێت بەژنەکەی دەڵێت:

— مێردەکەت گوتی: یەکێکم بداتیَ.

ئەویش تفێکی زار جوانەی لێدەکات و دەڵێت:

— سەی کۆرە درۆ.. دەکەیت و هەڵبەستی خۆتە.

ئەویش پەلی ژنەکەی دەگرێت و دەیهێنێتە بەردەرکەی حەوشەو دووراو دوور دەڵێتە مێردەکەی:

— ئەوا نامداتیَ؟.

ئەویش بەشێوەیەکی ئاسایی یەوە دەڵێت:

– کچێ بیدێ بیدێ.

ژنە بە پێکەنینەوە دەڵێت:

– کوڕە ئەو سەگەکۆرە داوای شتێکی زۆر قۆڕ دەکات.

مێردەکەی تێدەگاتو دەڵێت:

– کچێ پێنج دینار پارەی بدێ. ئەگەر داوای شتێکی تری کرد بیدە بەر شاپان.

٦-کشە دۆنگز:

کوڕە دەوڵەمەندێك گەلێك بەخۆیەوە دەنازیو هەرکە باوکی پێیگوت:

ئەمەوێت ژنت بۆ بهێنم.

ئەویش گوتی:

– بابە دووژن بەیەکەوە نەبێت نامەوێت.

باوکی هەرچەند هەوڵو تەقەلا دەدات لەکەلی ملهوڕی دانەبەزی. پاش تکاو ڕجایەکی زۆر لێکردنو گوتی:

– کوڕم کەس ڕازی نابێت دووژنت بەیەکەوە بداتێ. بەس با نێوانیان ((١٠)) دە ڕۆژ بێت هەتا خەڵك ڕازی بنو دووژنت بدەنێ.

کوڕە ئەوسا نەرم دەکات.

باوکی هەڵدەستێ قەیرە کچێکی زۆر مەکرۆ.و جاقی نێو بەندو باوانی بۆ دەخوازێتو .. واریقاتەکەشی خڕ لەمست بوو کە کەدەنێتو ئەوسا پێیدەڵێت:

– لەوچاوەتە دەبێ بەودە ((١٠)) ڕۆژەی وای لێ بکەیت نەتوانێت داوای ژنێکی دی بکات.

بووکەکەش لەوماوەیەدا نایەڵێت هەتا بەیانی سوکنات بدات و خەو میوانی دیدەکانی ببێت. هەرکە خەوی بهات بووایە تیلکێکی بەپاشەڵییەوە هەڵدەداو دەیگوت:

— هەستە ئەدی. منت بۆچی هێناوە.

هێشتا((١٠))دە ڕۆژە تەواو نەبوو بوو کوڕە چێشتانێك لەبەر..بەر.ڕۆژکە دادەنیشێت. لەبەر کەم نووستن و پەڕینی لەحەد بەدەر.. زۆر لاوازو بێ شنگ دەبێت.

مێش و مەگەز دەورە لەدەم و چاوی دەدەن و ئەویش بەکزییەوە، لەگەڵ دەست بڵندکردندا بۆ پاس کردنی مێشان دەڵێت:

— کشە دۆنگزینە، وەللا..لا نەکەون بەبابم دەڵێم:

— ژنەکی ئەوهاش بۆ ئێوە بینێت.

**٧-کوڕە ئەوە دایکمە:**

خوالێخۆشبوو ((کوێخا حەوێزی شاخە پیسکە)) ڕۆژێك لەگەڵ پیاوێك دەچنە سەر ڕێگای ژنان.

کوێخا بە کابرای دەڵێت:

— من خۆم دەشارمەوە، هەر ئافرەتێك دەرکەوت ئەگەر بەردم هاوێشت مانای وایە گایتم. ئەگەر نەمهاوێشت هیچ.

هەر ژنێك تێپەڕی بەردێکی هاوێشت.

تا دواجار ژنێکی کامل بەدەرکەوت، کوێخا بەردێکی هاوێشت.

کابرا گوتی:

— کوڕە ئەوە دایکمە؟.

ئەویش گوتی:

—تەنیا سێ جارم گایە، سێ جار.

**٨- کوڕە بمگێن:**

کابرایەك لەشاری هەولێر شەو سەعات دوانزدە بە سەرخۆشی دەگەڕێتەوە ماڵ.

گەڕەکەکەش چەند شەو بوو دزی لێدەکراو، پۆلیس بۆ گرتنی خۆیان لەکونو قوژبنو پەناو پاسارگان دا دەنوسێنن. هەرکە کابرا دەگاتە لایان پۆلیسەکان لێکرا چەك ڕادەکێشنو دەڵێن:

— کوڕ ڕاوەستەو لە جێگەی خۆت نەبزویت دەنا دەتکوژین.

ئەویش لەگەڵ دەست بڵند کردندا دەڵێت:

— کوڕە بمگێن مەمکوژن. کوڕە بمگێن مەمکوژن.

**٩-کورتانی جاحێڵی:**

فەقێیەکی چەند بڵێیت قۆزو بە تەبیعاتو کەشخە بووم. بەپت خۆم دەداوەشاندو لە هەموو دەراوێك ئاوم نەدەخواردەوە.

شەوێك بەناوی جومعانە بوومە ، میوانی بنەگەیەك. کیژێکی یەکجار جوانو ئەشمیلیان هەبوو. گوستان گوستان بوو نەك گەمە. دڵم دەلحاز بۆی بزواو ئاگری گرت. بەخۆم نەوەستام. جاربەجارە بە تیچاوی حەز حەزۆکێوە دیقەتم لەتۆقی سەری هەتا بنی پێی دەگرت.

ئەویش ئەوسا ڕەنگی دەپەڕی و سوور هەڵدەگەڕاو بە نازو نووزەوە چاوەڕەشە قەتێیەکانی دەبڕینە دوڕ چاوم. مچوڕکەی خەنی خۆشی بەناو

شاده مارەکانی لەشمدا مێرووڵەی دەکرد. هەر ئەوەتە سێ جرِ تیانە هەڵنەدەپەڕیم. لەکاتی نووستندا بەڕەیەکی نەخشینی لای پێیەکانمی دانا.

بۆ ئەوەی دڵی جەلب بکەم لەسەر گازەرەی پشت ڕاکشامو کلکە ئەنگوچکە کراسە شەعادە سپییەکەم بە چاوی خۆم داداو بەفیزێکەوە گوتم:

— بەڕەم ناوێت.

ئەو بەشتێکی تر تێگەیشتو بەشلەژانەوەگوتی:

— ئەیرۆ.. بۆ..!؟.

— کەبەهار داهات من جێی بەخۆمدا نادەمو کلکە ئەنگوچکی کراسەکەی خۆم بەسەمە.

خۆیو دایكو باوکی لەبەرم مردنو سۆتن: ((

— کاکە فەقێ بەهاران بن ڕەشماڵان زۆر ساردەو سەرمات دەبێت)) .

بێفایدەبوو.

شەو ڕاشکاو هەڵێکردە بای شەماڵ و ناوە ناوە، بە هۆی لەرینەوەی ڕەشماڵەکە خوناو بە سەرمدا دەباریو سەرما هورووژ می بۆ هێنام و زۆری نەبرد لەرزگرتمی. چ لەرزێك، وەك مریشکی سەربراو هەڵدەپەڕیمو چۆقە چۆقی ددانم لە دووردەوە دەبیسترا. تۆقرەم لێهەڵگیراو: ((

— ئێ .. خۆتازە بشمرم چاوەڕووم نایەت گازیان بکەم. ئەوجا هەر ئەو قەباحەتە مابوو حەیام لەکن کیژە برژێت)) .

ناچاربێ خوایشتی حەزم دەستم بەملاو ئەولادا گێرا. تاکو لە ڕاست سەرینگانم لەپاڵ چێورمەی دیوی ژوورەوەی چیغی ڕەشماڵەکەوە شتێکی

گرانم، بەخشو هۆڕ لەگەڵ دەست هات. نەمدەزانی چییە، کەچی زۆر پێی شکور بووم. وەختێك لەشم لەژێریدا گەرمداهات یەکسەر خەو بردمیەوە.

سبیانێ کاتی گزینگی ڕۆژدا، لە حریتە حریتی کیژەوە بە خەبەر هاتم. دیتم ئەوەی بەخۆمداداوە کورتانە. لەشەرمە تەریقیان لەشم سەرتاپا بووە ئارەقەو چاوی شەرمەزاریم بەخۆمدا شۆڕ کردەوەو بەهەڵەداوانەوە هەبیەم لێکرد.

لەدواوە گوێم لێبوو دەیگوت:

– کاکە فەقێ بە هەندی هەڵمەگرەو ئەوە کورتانی جاحێلییە، جاحێلی.

**١٠-کوڕو کچی فەقێ:**

سەردەمایەکی زوو کچیش دەرسی لە حوجرەی فەقێیان دەخوێند.

دوو فەقێ یەك کوڕ، ئەویتر کیژ، لە گوندێك لە گوندەکانی کوردستان دەبن . ڕۆژێك کچە ئەمەی بۆ کوڕە دەنێرێت: ((

– واها لحرج سلحفاة شکلها

أبیض لون ضیّق منفذها

کوڕە بەمە وەڵامی دەداتەوە:

واها لشطح کبر کالمطرقِ

أطرافها سوداء کالشخص الشقی.

وکل فرج مستحق للذکر

والأصل فیها أن تکون ((تەسكو تەڕ)).

١١-كوڕى من زۆر گەورە بووە.

ڕۆژێك كابرایەك لەنێو كۆمەڵێك ئاوقەرانى خۆیدا گوتى:

—خزمینە كوڕى من زۆر گەورە بووە.

ئەوانیش گوتیان:

—بووە بە مامۆستا؟.

—نەخێر گەورەتر.

—بووە بە پارێزەر؟.

—نەخێر گەورەتر.

—بووە بە ئەندازیار؟.

—نەخێر گەورەتر.

—بووە بە دكتۆر؟.

—نەخێر گەورەتر.

ئەوسا خەڵكەكە بەواق وڕمانەوە گوتیان:

—دەپێمان بڵێ: لە ئەوانەى گوتمان گەورە تر چییە!؟.

—هەركە مەلاو ڕدێن سپىو جوامێرانى ئاوایى دەچنە كنى بێزى ئایەت ئاخێزێكیان بۆ بكات.

.............................................

ئاخێز= خۆ جوولاتێكى كەم.

## ١٢-کوڕی من لەگەڵ دانەبووە:

ڕۆژێك ئەو منداڵانەی گوندی ((چەغەمیرە)):

١- عەبدوللای حەسەن ئاغا.

٢- ئەبوو بەکری مەلای ڕەش.

٣- قاسمی مەلای ڕەش.

٤- ئەبووبەکری موحەمەد بندیان.

٥- حوسێنی موحەمەد بندیان.

دەچنە ماڵی بێوەژنێك ((٩)) نۆ مریشکی دەبێت، حەوتیان سەر هەڵدەکێشن و کەلەشەکان بەدەست وەدەگرن و لەدەرەوە بانگ دەکەن و دەڵێن:

—هۆی گۆشت . هۆی گۆشت.

خەبەری مەلای ڕەش دەدەن:

—دوو کوڕی جەنابتی لەگەڵ بوونە.

ئەویش دەڵێت:

—کوڕی من لەگەڵ نەبووە.

—مامۆستا بەچاوی خۆمان دیومانە.

کەچی ئەو دەڵێت:

—بۆ خۆتان هەر وا بڵێن: دڵنیام ئەگەر کوڕی من لەگەڵ دابووایە دوو مریشکەکەی تریش رزگاریان نەدەبوو.

### ١٣-كوشتنی چی:

لەسەرەتای چلەکانی سەدەی ڕابردوودا ژن‌و مێردێك لە گوندەکەی خۆمان ((چەغەمیر)) لە دەرەوەی حەوشەیان بەشەڕ دێن. پیاوەکە ژنەکەی لەبنە خۆی دەنێت‌و وازیشی لێناهێنێت.

خەڵکەکە زۆر بەپەرۆشی ژنەکەی بوون پیاوەکە لە کۆڵی نابێتەوە.

خوالێخۆشبوو ((مام سمایل خەزاڵ)) یەختیارێکی باش‌و بەدینی ئاوایی بوو، زگی بە ئافرەتەکە دەسووتێت‌و بۆ ئەوەی ڕزگاری بکات هەتا گۆپاڵ دەگرێت لەپاشەڵی پیاوەکە دەدات‌و دەڵێت:

— کوڕە هەی ناپیاو ئەو ژنە قوڕ بەسەرەت کوشت هەستە وازی لێ بێنە.

کابراش دەڵێت:

— کوڕە کوشتنی چی!. ئەو لەبنەوە منی بەرزەفت کردووەو گونمی وا گرتووە هەر چەندی دەکەم بەرم نادات قیت بیمەوە.

### ١٤-کوفرە یارمەتی بدەم:

تازە ئۆتۆمبێل پەیدا بوو بوو، ڕۆژێك قەمەرەیەك لە نزیك گوندی ((عەوێنە)) لەقوڕی کەندێك دەچەقێت. چەند کەسانی ئاوایی دەچن تاکو پاڵی پێوە بنێن‌و دەری بهێنن.

یەکێکیان کە چاوی بەشۆفێرەکە دەکەوێت ((سیدارە))ی لەسەرە یەکسەر دەڵێت:

— ئەوە لۆیی ئەو کڵاوە پانەی لەسەر خۆیناوە تاکو خودا لەسەرەوە نەیبینێت، لۆیی کوفرە ئەگەر یارمەتی بدەم.

ڕێو ڕێ دەگەڕێتەوە.

**١٥-کیهانت دەوێت:**

ئافرەتێکی زۆر گێل‌و نەزان لە مێردەکەی خۆی تووڕە دەبێت.

مێردەکەی هەرچەند هەوڵی لەگەڵ دەدات ناگەڕێتەوە.

ڕۆژێـــك ژنەکــە لەبـــەر بێـــری ماڵـــە بـــاوکی مـــەڕ دەدۆشـــێت‌و بەدزییەوەپێیدەڵێت.

- جگە لە کێرەکەی خۆم دووترم پەیدا کردووە.

بۆ ئەوەی پێی بسەلمێنێت:

یەکەم: سوورەکەی خۆی نیشان دەدات.

دووەم: هێندە ڕێخی مەڕی لەسەری هەڵدەسوێت.

ڕەشدادەگەڕێت.

سێیەم: هێندە کەفی شیری بەسەر.. ڕیخەکە دەکات سپی دەبێت.

ژنەکە باوەڕی تەواو دێت: ((سێی هەیە)) ئەوسا بە گوراح خۆشـــییەوە لەگەڵی دەگەڕێتەوە.

مێردەکەی لە ڕێگادا پێیدەڵێت:

- کیهانت دەوێت؟.

ژنە دەڵێت:

- ڕەشەکە بۆ چاوو زارێ، سپییەکە بۆ بەرەکـەتی مـاڵێ، سـوورەکەش بەجەرگی باوکی خۆم نادەم.

### ١٦-کیژو پیشکە:

کیژو پیشکەیەك بەسەفەر دەچن لە ڕێگادا سەرمایان بەسەردا هاتو خۆیان گەیاندە ئافرەتێکو هەریەکەیان خۆی لە شوێنێکی ئافرەتەکە حەشاردا..

هەرکە دنیا گەرم داهاتو هاتنە دەرەوەو کیژ لەپیشکەی پرسی:

— ئەرێ جێگاکەت چۆن بوو؟.

گوتی:

— چەندی بڵێیت گەرم بوو، بەڵام ناوە ناوە کەرتە شاخێك دەهاتە خوارەوە ئەگەر خۆم نەدابووایە پەنایەك هەپڕوون، بە هەپڕوون دەبووم.

پیشکە لەکیژی پرسی:

— ئەی جێگای جەنابت کوو بوو؟.

گوتی:

— چەندی بڵێیت گەرمو نەرم بوو. بەس ناوە ناوە ئەفەندییەکی سەر سۆرم بەهەڵەداوانەوە لێمدەهاتە ژوورەوە هەتا دووتفی زار جوانەی لە دورِ چاومی نەکردبووایە، نەدەگەڕاوە.

پیشکە ئەوسا گوتی:

— ڕاست دەکەیت. هەرکە ئەفەندییەکە دەهاتە ماڵی ئێوە هەگبەیەکی لەپیش ماڵی ئیمە هەڵدەواسی.

### ١٧-کێری باوکی ماچ بکە:

کابرایەك ژنێکی زۆر جوان دەبینێت منداڵێکی لە ئامێزەو پێیدەڵێت:

—بێنــە منداڵەکــەت مــاچ بکــەم چــونکە لــە شــتە جوانەکــەی تــۆ دەرهاتووە.

ئەویش خۆی لە گوورەنابات‌و دەڵێت:

—ناوەللا برۆ کێری باوکی ماچ بکە.

**١٨-کێری کەرێت تێ:**

دوو بێوەژنی گەنج‌و زۆر کۆك‌و تامەزرۆی گان دراوسێ بــوون. ڕۆژێــك تێك دەگیرێن‌و چ جوێنی ناشیرینە بەیەکتر دەدەن.

لەدواجاردا یەکێکیان بەویتر دەڵێت:

—کێری کەرێت تێ.

ئەویش لەخۆشیان ناودەپەڕتە دەمیەوەو لەدڵەوە منگاندی‌و : ((خۆزگە وابووایە)) کەچی بە بزەیەکەوە ڕوولە غەنیمەکەی دەکات‌و دەڵێت:

—وەللا کوڕەش بیت ئەوخۆشییەت حەوالەناکەم.

**١٩-کێرێکی حیز:**

سونەتکەرێك= ((کێر بڕ)) لە نێو نــاوایی یەکــدا دەگــەڕێت‌و نیشــی تەواو دەبێت‌و.. ویستی بڕوات یەکێك پێیدەڵێت:

—چیت وەدەست کەوت؟.

ئەویش بەهەناسە هەڵکێشانەوە دەڵێت:

—تەنیا کێرێکی حیزم سونەت کرد.

**٢٠-کێشەی ئاغاو کرمانجان:**

دوای بــەرپابوونی شۆڕشــی ((١٤)) چــواردەی گەلاوێــژی ســاڵی ((١٩٥٨)) هــەزارو نۆســەدو پــەنجاو هەشــت. بــە ســەرکردایەتی

خوالێخۆشبوو: ((زەعیم عەبدولکەریم قاسم)) ئاغا دەورو زەبرو زەنگیان کۆتایی هات. جوتیار برەوی ساند.

لە نێو شاری هەولێر چەند هوتافات لێدەدرا. کەچی بەداخەوە زۆریانم لەیادنەماون ئەمانەی خوارەوە هەندێکیانن:

—ماکو زەعیم
ئیللا کەیم.

—زەعیم زەعیم لیلنەمام
دیموکراتییەو سەلام.

—لیکو للی ئومەتین زەعیم.
زەعیمونا عەبدولکەریم.

—بژی گەل- رۆڵەی گەل.
مام رەحمان و شێخۆشەل

((دوو پیاوی بە بزێوی حیزبی شیوعی بوون)).

کرمانجە زوڵم لێکراوو داخ لەدڵەکان هەرکە چاویان بە ئاغا دەکەوت ئەمانەیان دەگوت:

—سینی نییە کاشییە
ئاغا گەوادە باشییە.

—پەنیر نییە ژاژییە
ئاغا تۆخمی تاژییە.

ئاغاش هەرکە دەوریان گەڕاوەو چاویان بە جوتیارەکان دەکەوت و دەیانگوت:

—بن دیوار بن بن دیوار

دایکتان دەگێن شەعبی پار.

**٢١-کێ کفتەی خواردووە:**

لەزەمانی زوو کوڕێك ژن دەگواستەوە. شیوی بووك ئەوسا ((کفتە)) دەبێت.

زاوا بە ئیشێك دەچێت و هەتا دێتەوە کفتە نامێنێت. زۆر تووڕە دەبێت بەس دەنگ ناکات.

ئێوارە پێیدەڵێن:

—کاتی هاتووە و بڕۆ لای بووك.

ئەویش دەڵێت:

—کێ کفتەی خواردووە، با ئەویش بچێتە لای بووك.

## پیتی ـ گ ـ

### ١-گانی حەرام:

بێوەژنێك میوانی ماڵی مەلایەك دەبێت و شەو لە نزیك مەلاژن دەنوێت.

مەلا شەو زەوقی هەڵدەستێت دنیاش تاریك و لەگەڵ خێزانی خۆی جووت دەبێت.

بەیانی کاتی رۆژهەلات هەرکەدیتی مەلاژن وسلی لەخۆی دەرنەکردووە و میوانەکەش نەماوە زانی و بە سەربادانی قارەوە گوتی:

—بەخوا دەبووایە لە لەززەتی زۆرەوەی بمزانی بووایە گانی حەرامە.

### ٢-گەردەلوولە:

هەرجارێك گەردەلوولە پەیدا بووایە من خۆم تێوەردەدا، یان ئێمەی منداڵ دەمانگوت:

— گەردەلوولە هەڕوە ماڵی گەوادی. گەردەلوولە هەڕوە ماڵی گەوادی.

جارێك گەردەلوولەیەکی زۆر گەورە هات. منیش لە پێش ماڵی خۆمان خۆم فجوڕکردێ. جگە لەکەندەکەی پێش ماڵمان چەند قۆرت و کۆسپەی گەورەو گچکەم کەوتە بەرپێ و گوێم پێنەدا، لەدواجاردا پێم

کەوتە سەر کۆسپەیەکی گچکەو هەڵوەستەم کرد. پاش ڕەوینەوەی گەردەلوولەکە دیتم پێم وا لەسەر .. لێوی بیری ((کەندێ))یە.

بیرەکە هەرجارێك کەندەکەی ڕۆخی بهاتبووایە پڕ ئاو دەبوو. ژێرەوەی بوو بووە گەوەڕێکی کاکی بەکاکی . دەڵێن: ئەوەی ئەجەلی نێت نامرێت. زۆر.. ڕاستە ئەوە من بووم. خوا بەعەمەلی خۆمی لەگەڵ نەکردم. ئەگەر هەنگاوێکی دیکەم بهاوێشت بووایە نیشم لەنێو ئەو بیرە ((٣٠))سی مەتر قووڵە تەواو دەبوو.

### ٣-گوو بەگۆڕت بێت:

پیاوێکی تەمەن ((٨٠)) هەشتا ساڵ بەحوکمی پارە کچێکی ((١٤)) چواردە ساڵی دەخوازێت. هەرچەند هەوڵ دەدات چی بۆ نەدەکرا: ناچار بۆ ئەوەی کیژەکەی بخافڵێنێت هەرجارێ سەری کێری بەعەورەتی دادەهێنا هەتا کچەکە ئاوی دەهاتەوە.

چەند ساڵی پێچوو.. و کابرا دەمرێت‌و ئافرەتەکە مێرد بە پیاوێکی جاحێڵ دەکات. ئەوکات دەزانێت: ((ئەمە لەکوێ‌و ئەو لەکوێ)).

ناوە ناوە دەچووە سەر گۆڕەکەی‌و بە پێلەقە، لە قەبرەکەی دەداو دەیگوت:

— گوو بەگۆڕت چەند ساڵە منت بەم درۆیە خافڵاندو دەتگوت: ((گان لێ خشاندنە، نەك چوونەناو)).

### ٤-گوو خواردنی بەتەنیا:

کابرایەك ژنێکی زۆر جوانی دەبێت‌و ئەفعالی باش نابێت‌و زۆر پێی هەراسان دەبێت. برادەرانی بۆ دڵدانەوەی پێیدەڵێن:

– وا لەگەڵ خەڵك ئەو هەنگوینەی دەخۆیت هێشتا ڕازی نیت.

ئەویش دەڵێت:

– گوو خواردنی بەتەنیا لام سەت قات خۆشترە لە هەنگوینێك لەگەڵ خەڵك بێت.

**٥-گووی باوکی خۆم:**

پیاوێکی ناوچە کوێستانەکانی کوردستان، لە شەوێکی هەرە ساردی وەرزی زستاندا لەگەڵ خێزانی خۆی جووت دەبێت: لەکاتی نوێژی بەیانیدا دەچێتە سەر جۆگەکەی بەرماڵان ((وسل)) دەربکات. لەبەر دنیا ساردی لەرز دەیگرێتو هەرچەند تەکان لەخۆی دەدات لێوەکانی وێك نایێتەوە نییەت بێنێتو چەند جارێك دەڵێت:

– نییەتم، نییەتم......

بۆی تەواو ناکرێت . لەدواجاردا هەرکەدەزانێت بۆی نایەت دەڵێت:

– نییەتم وایە جارێکی تر گووی باوکی خۆم نەخۆم.

**٦-گۆردەو چەورە:**

لە ڕاپەڕینی جوتیارانی دەشتی هەولێر، ساڵی ((١٩٥٣))دا ئەم دوو.. پەیڤە سەری هەڵدا:

**یەکەم: گۆردە:**

گۆردە مانای گەوادێکی مل پان، دەقەبەڵ ئەو جوتیارانە کرا، کە لەکاتی سوێندخواردنی ((خێرمان خێرو، شەڕمان شەڕ))دا لایەنگیری ئاغا بوون.

دووەم: چەورە:

چەورە بەوكەســە دەگوترێــت شــتێك بەكــەیفو ماشــای خــۆی. جێــی هێشتبێتو بۆی بگەڕێتەوە.

ئەمەشــ دەقەبەڵ ئەو جوتیارانەكرا ســوێندیان خواردبــوو ئامەشــۆی ئاغا نەكەن. پاشدان پەشیمان بوونەوەو چوونەوە كن ئاغا.

## پیتی - ل -

**١-لابس گونیه:**

گـەنجێکی قـژزو ئاکـار..جوان‌و ڕێـک‌و باڵابـەرزو ڕانـک‌و چـۆغەیەکی شینکی نوێم لەبەردایەو کڵاشێکی پەڕۆیینی سپی لەپێ‌و بەرک پـڕ پـارەو بێکار، بەفاك فیکی لووت بەرزییەوە، لەشەقامی ((سەعدوون))ی شـاری ((بەغدا)) پیاسـەم دەکـرد. ئامانەیـەك لـە ((قەتعە))یـەك ڕایگـرت‌و خـەڵکێکی زۆر سـواربوون. دوای خەڵکەکـە ئـافرەتێکی گـەنج‌و شـلك‌و نەشمیل‌و سفوور سەرکەوت. منیش: ((ئێـ..ھ)) بەدوایا خۆم تێکوتا. ناوەوە جمەی دەهات. بەئەنقەست خۆم لێـی نزیـك خسـتەوەو دووسـێ جـار شـانم لەشانە سوورو سپی‌و گۆشتنەکەی خشاند. کاتێـك بەدڕدۆنگیـەوە ئـاوڕی لێدامەوە گوتی: ((

—لابـس گونیـە یضرب کشـخە علینـا))= گوشـی لەبـەر کـردووەو لافیشمان لەسەر لێدەدات.

**٢-لەئێوەیە، یان لە ئێمە:**

کابرایەکی دەشتەکی کەڵەبابێکی شامی گـەورەو جـوان دەباتـە بـازاڕ بیفرۆشێت.

کابرایەکی دیکە لەلارا بۆ قەشمەری پێکردن پێیدەڵێت:

—خاڵە ئەو کەڵەشێرە لە ئێمەیە، یان لەئێوە؟.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

—لە گوو خواردن لە ئێوەیە، کەچی لەبانگداندا لە ئێمەیە.

**٣-لەخەرات نەدراوە:**

ڕۆژێــک خوالێخۆشــبوو ((مــەلا عەبــدولرەحمان باشــتەپەیی)) لــە مزگەوتی ناو بازاڕ دەست بەناو دەگەیەنێت:

یەکێکی شاری هەولێر پێیدەڵێت:

—ئەنگۆ خەڵکی دەشت لە ئاودەست گــووی قــەت ڕاســت بــە ڕاســتی کونەکەی ناکەنو بەملاو بەولای دادەکەن.

ئەویش بــێ ئەوەی خۆی لە گوورەببات دەڵێت:

—ڕاست دەکەیت. چونکە ئێمە قوونمــان بەمنــداڵی وەك قــوونی ئێــوە لەخەرات نەدراوە و خوارە بۆیێ هەرچەند هەوڵدەدەین گووەکەمان وەك ئێوە لەراست کونەکە پێناکرێت.

**٤-لە ڕۆژی تۆپانێدا:**

لە ڕۆژێکی تۆپانێی نێوان تیپی هەولێرو دهۆکــدا شــەڕ بــەرپا بــوو. خەڵکی هەر دوو شار، تەرحی باوە کوشتەی یەکتربن لە یەکییان دەدا.

یەکێکی خەڵکی شاری دهــۆك دەکەوێتــە نێــوان کۆمەڵــە کەســێکی شاری هــەولێر، تــاکو بەرحەملــەیان نە ـەوێت یەکســەر لۆچــی نیفــۆی شەرواڵ= شەلوارەکەی لەپێشەوە بردەپشتەو بەو فێڵە سەلامەت دەرچوو.

**٥-لەسەرحەق:**

ئافرەتێك لەسراوێ دەگەڕاوەو جەرە ئاوێکی لەسەر شان بوو. تووشی پیاوێك هات سەری خوێنی پێدادەهاتە خوارەوە.

ژنەکە لێی پرسی:

—ئەوە لۆ.. سەرت شکاوە؟.

—لەسەر حەق گوتن لێمدراوە.

باوەڕی نەهاتو گوتی:

—راست ناکەیت، کەس لەسەر حەق گوتن لێینادرێت.

کابرا دەڵێت:

—ئەتووش لێمدەدەیت ئەگەر قسەی حەق بکەم.

—من هۆباب لەو کەسانە نیمە لەسەر حەق لەکەس بدەم.

کابرا ئەوسا دەست بۆ ناوگەڵاتی ئافرەتەکە درێژ دەکاتو دەڵێت:

—ئەوە قوزنییە؟.

ژنە یەکسەر جەرە ئاوەکەی لەتۆقی سەری دەدات.

**٦-لەسێ مەوجەکانە:**

چەند گەنجێکی خەڵکی شاری هەولێر بەسەرفەر دەچنە شاری سلێمانی.

چەند لاوێکی سپۆرت بەرەو ڕوویان دێن. یەك لە هەولێرییەکان بە ئەنقەست دەڵێت:

—بەخوا بابە سلێمانی قەزایەکی خۆشە.

یەکێکیان گورگانە ئاوڕ دەداتەوەو دەڵێت:

— ئەوە لەسێ مەوجەکانە.

**٧-لەکیژی خۆمان ناترسێین:**

یەك لە ئاغاکان باغچە((حەدیقە))یەکی مێـو.و گـوڵو شـتی تـری دەبێت. ساڵێ لەکاتی بڕینەوە خۆشناوێك دەچوو بەکرێ بۆی دەبڕینەوە.

ئاغاژنی خاوەن حەدیقە جارێك بەخۆشناوەکە دەڵێت:

— ((فلاّن= ناوەکەیم لەیاد نەماوە)) مێوەکانتان . عەیب ناکـەن هـەر ((غەوارە)) یەك دێت ژنی دەدەنێ.

ئەویش یەکسەر بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە:

— ئاغـا ژن ئێمـە لەکیـژی خۆمـان ناترسـێین. بیدەینـە عـەرەبو عەجەمان، سەرمان پێی بڵندە، بەڵان ئەنگۆ خۆ بەخۆ نەبێت ناوێرن کیژی خۆتانی بدەنێ.

**٨-لەمست دەنێت:**

لەزەمانی کۆندا دوو پیاو لە وەرزی ساردیدا سـەردانی ماڵـە خزمێـك دەکەن.

ئەوسا نوین وەك ئێستا نەبوو.و زۆر کەم بوو.

هەردووکیان بەیەکەوە دەنوێنن.و جاجمو بەڕەیەکیان پێدادەدەن.

شەو یەکێکیان ئەویتر بەخێزانی خۆی تێدەگاتو دەست بۆنساو گـەڵانی دەبات.

ئەویش سێو دووی لێناکات عەورەتی خۆی بە ڕووتی لەمست دەنێت.

**٩-لەوتە بەنرخەکانی مامۆستای خوالێخۆشبوو((مەلا مەسعود بێبەش))**

**أ.پیاو کەپیر بوو ژن پێیدەوەستێ**

**لەجیاتی کێری زەختی هەڵدەستێ.**

**ب.لەززەتی پیاو دادان و کێرە**

**ئەو دووەت نەمان مردنت خێرە.**

**١٠-لۆ ئەوان زۆر دەکات:**

سەردەمایەك ئازووقە زۆر بەکەمی وسستی دەدرا. خەڵکەکە وای بۆ دەچوون ((بایەع))ەکە بۆ خۆی دەدزی.

ڕۆژێك ئافرەتێك لەنێو پاسدا بەئەوی تەکییەوەی گوت:

—خوشکم ئەوەندەی لەمن دەبڕن و ئەوەندە لەتۆ دەبڕن و ئەوەندەی لەیەکێکی دەبڕن لۆ ئەوان زۆر دەکات.

**١١-لۆ.ڕاو هاتوویت، یان.....**

ڕاوچییەك دەچێتە ڕاوو دووراودوور شێرێك دەبینێت. بەماتەمات خۆی لێ نزیك دەکاتەوەو سێرەی لێدەگرێت و تەقەی لێوەدەهێنێت و پێیناکەوێت.

شێرکە دەچێتە لای و پێیدەڵێت:

—لەتۆڵەدا بتخۆم، یان بتگێم؟.

ئەویش ڕەزامەندی بۆ دووەم دەردەبڕێت.

ڕاوچییەکە چەند هەنگاوێك دەڕوات، خۆی بەکارەکە بەخەجاڵەت بار دەزانێت و دەگەڕێتەوە. لەهەمان شوێندا تەقەی بۆ دەکاتەوەو دیسان بەرناکەوێت.

شێرەکە دووبارە ڕاوچییەکەی دەعەمەل دەهێنێت.

ڕاوچییەکە ئەوجارە هەتا دەگاتەوە نزیك گوندەکەیان هەنووب خەجاڵەتی پەشیمانی دەکاتەوەو دەڵێت:

— هەردەبێ بیکوژم:

ڕاوچییەکە هێشتا پەنجەی لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکەیدانەنابوو شێرەکە گەیشتەسەری.

ڕاوچییەکە ناچار بەترس‌و لەرزەوە گوتی:

— حەقی خۆتە هەرچیم لێدەکەیت.

شێرەکە گوتی:

— چت لێناکەم بەس پێم بڵێ: تۆ بۆ ڕاو هاتوویت، یان بۆ قووندان؟.

**١٢-لێمگەڕێ:**

کچێکی منداڵکارو بەژن کورت‌و لاواز مێرد بە پیاوێکی زەبەلاح‌و کاپێلك نەستوور دەکات.

ژنە هەرکە شەو چاوی پێدەکەوێت ترس‌و سام دایدەگرن‌و بەجاوە جاو دەڵێت:

— مامە لێمگەڕێ دەچم دایکمت لۆ دەهێنم.

## پیتی - م -

**١-مادام ئەوسەر شۆڕە:**

پیاوێکی بەتەمەنی واکە کەڵکی پەڕینی نەمابوو شەوێك خەون دەبینێت ((هەردوو گونی لێدەدزن)).

بۆ بەیانی بۆ ژنەکەی گێڕاوە.

ئەویش بەڕوویەکی دڕدۆنگەوە دەڵێت:

— هەتا ئەو سەر شۆڕە حەرەسیان بێت ڕۆژێك هەر لێتدەدزن.

**٢-مادام وایە:**

لەساڵی: ((قالە.. لەخەت گیراوە))دا کابرایەك لەشاری هەولێر بەخۆ.و گوێدرێژەوە لەسەر ئەوخەتەی بۆ پەڕینەوە کرابوو ناپەڕتەوەو دەگیرێتو داوای پارەی سزا لە خۆیو کەرەکەی دەکەن.

بەس پارەی سزای کەرەکە نیوەی هی خۆی دەبێت.

کابرا زۆر هەوڵ دەدات عەفووی بکەن بێ فایدە دەبێت. کە دڵنیا دەبێت هەر لێیدەستێننو دەڵێت:

— ((مادام وایە هەر وەکی کەرەکەم حسێب بکەن)).

### ٣-ماكوشی ماكوشی:

منو خوالێخۆشبوو ((مەلا عەباسی برایم كارەوان)) ئاوزەبووین. ئەوجكە بوو.. و لەمن كورتو لاواز تر بوو. تەمەنمان دە دوازدە ساڵ دەبوو. لە حوجرەی گوندی ((لاوەر))ی بنار كێوی ((قەرەچوغ)) فەقێ بووینو دەمانخوێند.

ڕۆژێك عەرەبێكی بە ((دو)) قەسپی هێنا ئاوایی. منو عەباس پارەمان برد قەسپ بكڕین.

عەرەب بۆ قەسپ كێشان بەتەرازوو چۆكێكی گەیاندبووە عەردیو چۆكەكەی تری بڵندكردبوو. دیشداشەكەی تۆزێك لەسەر ئەو پێیەی بڵندی كردبوو لاكەو تبوو.و چشتەكەی لە دەرەوە بوو.و دەتگوت ماری ڕەشە.

هەر ئافرەتێك بۆ قەسپ كڕین دەهات دەیدیتو بە چارۆگەی ملی چاوی دەگرتو دەچووە لایەكەی دیكە دەوەستا.

من پەلەپیتكەم خواربوو، كەچی مەلا عەباس یەكاو یەك بوو.ئاگای لێنەبوو.

من چووم بەدزی خەبەرم دایە. لەلایەكەی دی وەستابوو .و گوتم:

— لەو چاوەتە هەرەكەتێك بكە.

هەركە دیتی گەڕا بەردێكی بە ئەندازەی قلە نۆكێكی پەیداكردو بەهەموو هێزییەوە لەسەرەكەیدا.

عەرەب لەگەڵ گوتنی:

— یەیابە.......

یەك ڕم لەخۆی هەڵداو قەسپی ناو تەرازوو پەرتو بڵاوبووەوە.

خەلکەکە پێیان گوت:

—چ بوو..؟.

لەگەڵ هەڵپشافتنی گەڵو گوانی گوتی:

—ماکوشی ماکوشی = چ نەبوو چ نەبوو.

بەم جۆرە نەدەبمان پێداپۆشت.

٤-مام سۆفی:

خوالێخۆشبوو ((مام سۆفی مەولود))ی گوندی ((باغەمرە))ی نزیک گوندی ((مورتکە گەورە)) هەموو ڕۆژی جومعە بۆ نوێژ دەهاتە گوندی مورتکە.

کەرەکەی ماکەر بوو. ڕۆژێك هات بە ((تەڵەب)) بوو.و پێیان گوت:

—مام سۆفی ماکەرەکەت بۆ چاناکەیت؟.

ئەویش گوتی:

—نێرەکەرم دەست ناکەوێت.

گوتیان:

—چ زۆرە نێرەکەر زۆرە.

دوو پیاوی ئاوایی لەم ساتەدا پەیدابوون ((ناوهێنانیان هەموار نییە)) یەکیان بالآبەرزو بەشاقەڵ، ئەوی دی گچکەو لاوازو پووزە.

مام سۆفی بەسەربادانی نارەزایی یەوە ڕووی لە هەر دوو پیاوەکان کردو گوتی:

— کا.. لەنێرەکەرێکی حالۆری ئەوهای چاك بکەم، کا.. لەنێرەکەرێکی پووخەڵەی ئەوها .

### ٥-مامۆستا كەرسم:

پیاوێك لە گوندەكانی دەوروبەری شارۆچكەی ((قوشتەپە)) لەمانگی ڕەمەزان دەچێتە لای مەلای ناوایی ((سەرفترە))ی بدات. ناوی كچێكی لەبیر دەچێت‌و ناچار.. ڕووی لەخەڵكەكەی دەورو بەردەكات‌و دەڵێت:

— ئەرێ ژنی سوارەی ناوی چییە؟.

((سوارە پیاوێك بوو سەردەمایەك، بەخێزانەوە چایەخانەی لەسەر ناوی ((مورتكە))ی گچكەی سەر شەقامی كەركوك دانابوو )).

ئەوانیش دەڵێن:

— ناوی ((كەلسوم))مە.

ئەویش ڕووی لەمەلا دەكات‌و دەڵێت:

— مامۆستا كەرسم.

### ٦-مەرجی مێرد كردنی بێوەژنێك:

بێوەژنێكی تەڕو بڕ دەبێت‌و دەڵێت:

— من مێرد بە پیاوێك دەكەم یەكەم شەو پێنج گانان بكات.

موشتەری نابێت تاكو ڕۆژێك ((حەمە ڕەش)) ناوێك دەڵێت:

— من شەوی یەكەم پێنجت لەگەڵ دەكەم.

مێردی پێ دەكات.

شەو لەبریتی پێنجان شەشان دەكات.

بێوەژن لەخۆشیان دەڵێت:

— چاوی چاوم حەمە ڕەش

قەولمان پێنج بوو كردت بەشەش.

٧-مەڕ دارو ئاو خۆرەوە:

مەڕدار لە دەشتی هەولێر زستانان بەخزمەت کردنی مەڕو ماڵات زۆر هیلاك دەبوو. لەنیوەشەودا هەڵدەستا ئالیکی دەدانیۆ ئەگەر مەڕێك لەسەر زان بووایە، ناچار دەبوو لەدیاری بووەستێتو رزگاری بکاتو فرچکیش بداتە بێچووەکەی.

کەسانی فەقیرو ئاو خۆرەوەش شەوان لەبەر ئاگر دادەنیشتنو هەتا بەیانی لەژێر پێخەف نەدەهاتنە دەرەوەو دەیانگوت: ((

—دادەنیشم لەدیار پۆلیەسۆرێ
کێرم بەقوونی مەڕ زۆرێ)).

هەرکە بەهار دادەهات ئاو خۆرەو فەقیر بەیانیو نیوەڕۆ خواردنیان تەنیا نانە وشك بوو.. و مەڕداریش تێر سپیاتی = ((ماستو پەنیرو لۆروکەرە رۆن))وەدەیانگوت: ((

—دەخۆم نانو پەنیری
کێرم بەقوونی فەقیری)).

٨-مەگەر بەسەر........

سەردەمایەك بەهۆی نەهاتیو قڕییەوە گۆشت خواردن زۆر کەم دەبێتو هەندێك لە خەڵکی هەژاری گوندێك لەتامەزرۆیی یان شەو کوێر دەبن.

بۆ ئەوەی حاڵ خۆشەکان بەزەیی یان، بەخەڵکە هەژارەکە دابێتەوە مەلا لەخوتبەی جومعەیەکدا دەڵێت:

– هەرکەسێك ئاژەڵێك بکوژتەوەو گۆشتەکەی بەسەر خەڵکی تامەزرۆ دابەش بکات لەڕۆژی قیامەتدا بۆی دەبێتە ((بۆراق))و لە پردی سیراتیی دەپەڕێنتەوە.

ڕۆژی دوایی پیرێژنێکی دیندار بەمەلا دەڵێت:

– مامۆستا من بەرانێکی گەورەم کوشتەوەو گۆشتەکەشم هەموو بەسەر خەڵکەکە دابەش کرد، ئایا لە ڕۆژی قیامەتدا لە پردی سیراتێم دەپەڕێنتەوە.

مەلاش دەڵێت:

– بەڵێ دەتپەڕێنتەوە.

– بەس مامۆستا: بەداخەوە گەیشتە ماڵی جیرانەکە تانو خلاس بوو.

مەلاش دەڵێت:

– چما بۆ ماڵی منت نەبردووە!.

– ناوڵلا.

مەلا بە تورەیی یەوە دەڵێت:

– مەگەر بەسەر ئەو کێرەی دا بپەڕیتەوە.

**٩-مەلاو خوتبەدان:**

مەلای گوندێك هەموو جارێ لە ڕۆژی هەینیدا یەك خوتبەی دەخوێندەوە.

ڕۆژێك چەند گەنجێکی مەفتووق خوتبەکەی لەبەرگی جوبەکەی دەدزنو تاکو بزانن، بەبێ نوسخەی خوتبەکە چدەکات.

مەلاش هەرکە هەڵدەستەوە خوتبەبدات و دەست لەبەرکی جوبەکەی دەنێت خوتبەکەی نەماوە. یەکسەر دەحسێیت خوتبەکەیان لیدزیوە.

لەگیرفانەکەی تری خوتبەیەکی یەدەگی هەڵگرتبوو.و دەری دەهێنێتو بەزەردەخەنەو ڕوویەکی گەشەوە، لەکاتی گوتنی: ((

ألحمدالله پم ألحمدالله.......))، بەهێنانی بردنی دەستێکی قوچاوەوە ئاماژەی بۆ خەڵکەکەی دەکرد.

**١٠-مەنەلۆجی ئەمپێر:**

ژیانی کوردان بەرەو خێرە

کارەبایان بە ئەمپێرە

دە ئەمپێر بەس بۆ پارە دار

چوار ئەمپێریش شەنسی هەژار

لەهاوینان قرچەی تەمووز

هەراسانە چرکەی فیوز

هەرکە چرکەی فیوز بیسترا

خەوی چاوان لێکرا زرا

یاللا راکەن بۆ دەرەوە

پلەی سێرکێت هەڵدەنەوە

سەفاو مەرِوای نیوەرِۆیان

پشوو سواری‌و زرچەی هەنیان

هەرتۆ مابووی لەکۆری ژیان

تۆش بەخێر بێیت گوڵی باخان.

**١١-مەهاجەی کەران:**

لەساڵی ((١٩٦٣))دا گۆڕ بە گۆڕ چوو: ((بەدرەدین عەلی))ی موتەسەڕیفی ئەوسای شاری هەولێر بوو شەکرو چاو زۆر شتی تری قەدەغەکرد بۆ.. دێهاتەکان بچن. یەك کیلۆ شەکر لەسەیتەرەکان دەرباز نەدەبوو.

خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری شار، ناچار بەسواری گوێدرێژ تەفتیش نەدەکرا دەچوون پێویستی ڕۆژانەیان دەکڕی.

بەدرەدین عەلی هەر کەزانی هەر سوار گوێدرێژێك دەهاتە شار کەرەکەی دەگرت و کابرای بەرەڵلا دەکرد. کەرێکی یەکجار.. زۆر گیران،، هەر بۆیە ئەو ساڵە لەلایەن خەڵکەوە بەساڵی ((کەرگیران)) ناو دەبردرێت.

کەری بەستەزمان. بەبێ ئالیك و ئاو لەلای ((قەزاوە)) نزیك نەخۆشخانەی کۆماری، ئەوسا چۆڵ بوو، لەنێو سمێك بەند کرابوون خاوەنەکانیان ناچار ڕۆژێ دەچوون، ئاوو ئالێکیان بۆ دەبردن.

هەرکە لەخەڵکەکەی پرسیاردەکرا:

— کێوە دەچن؟.

— دەچینە مەهاجەی کەران.

**١٢-مەی بارید:**

پیاوێکی کورد دەچێتە شاری موسل. عەرەبی نەدەزانی. کاتێك بیستی کابرایەك بانگ دەکات:

— مەی بارید. مەی بارید.

ئەویش دەبێتە مەراقی و دەیکرێت. هەرکە دەیخواتەوە دەڵێت:

—هەر دەڵێن: مەی بارید، مەی بارید بەحەقی خودا تام ئاوی ساردی لێدێت.

### ١٣-مەیشۆن:

ژنێك پیاوەکەی ئەمرێ خوای بەجێ دەهێنێتو زۆر بۆی بەپەرۆش دەبێت و گریان بەرۆکی بەرنادات. هەرکە تەرمەکەی بۆ شۆرین لەسەرتاتەشوار دادەنێن ئافرەتەکە بەگریانێکی گوڕترەوە دەڵێت:

—مەیشۆن، مەیشۆن دوێنێ خۆی شوشتووە دوێنێ .

### ١٤-مریشك بێ کەڵەباب نابێت:

کۆڕێکی گەورەو چەند ڕۆژێ، دەربارەی ئیملای زمانی کوردی لەشاری هەولێر بەسترا.

((بەداخەوە ساڵەکەیم لەیاد نەماوە)).

چەند نووسەری ڕۆژهەڵاتی کوردستانی داگیر کراویش بەشداربوون.

لەدانیشتنێکدا سێ نووسەری ئافرەتیان لەپشتە من دانیشتبوون. یەکێکیان ڕووی زاری تێکردمو گوتی:

—مامۆستا بۆ لەزێدە هەموان تەنیا جەنابت کڵاوو جەمەدانیت لەسەرە؟.

منیش گوتم:

—مریشك بێ کەڵەباب دەبێت؟.

هەرسێکیان لە حریتەیانداو گوتیان:

—ئێمە ڕازینە جەنابت ببێتە کەڵەبابمان.

### ١٥-منداڵ بوون پەخوایە:

دووئافرەتی دۆستی یەکتر دەست بەقسان دەکەنو یەکیان دەڵێت:

— کیژی من ئەواحەفت ساڵی ڕەبەقە مێردی کردییەو منداڵی نەبووە.

ئەویدیکە لێیوەردەگرتەوەو دەڵێت:

— خوشکم منداڵ بوون بەمێردکردنیێ نییە، پەخوایە، پەخوا.

بۆ ئەوەی قسەکەی خۆی پیێ بسەلمێنێتو دەڵێت:

— کیژی من چ مێردیشی نەکردییەو دووکوڕیژکەشی هەیە.

### ١٦-منداڵی پیێ نەگرتە:

لەزەمانی زوو ئەگەر منداڵێك، بەهۆی نەخۆشی، یاخۆ لەبەر هەرشتێکی دی درەنگ پێی بگرتبووایە، خاوەنەکەی لەکاتی دابەستنی نوێژی هەینیدا هەر دووپێی منداڵەکەی دەبەستاو لەبەر دەگەی حەوشەی مزگەوتی دادەنا.

ئەوکەسەی لە پێشان لە مزگەوت دەهاتە دەرەوە پێی منداڵەکەی دەکردەوە.

گوایا بەم تەرزە منداڵەکە پێدەگرێت.

### ١٧-من لە ئێستاوە هیچم:

لە زەمانی زوو پیاوێك لەشاری هەولێر هەبوو ((ساڵحە شێت))ی پێدەگوترا. نۆبات بە ((ساڵح ئاغا)) بانگ دەکرا.

لەهێندە قسان شێتێکی بەداكو باب بوو.و لە هێندە قسانیش عاقڵێکی تەواو.

ڕۆژێك عەریف شورتەیەك دەچێتەلای دادەنیشێت.

سالحه شێت پێیدەڵێت:

– تۆ ئێستا چیت؟.

– عەریف.

– پاشدان دەبیته چی؟.

– ڕەئیس عورەفا.

– دوایی؟.

– موفەوەز.

– پاش موفەوەزی؟.

– ملازم.

– پاشدان؟.

– معاونی مەرکەزێك.

– دوای معاونی؟.

– مدیر شورتە.

– لەپاشان؟.

– وەزیر.

– پاش وەزیرایەتی؟.

– هیچ.

سالحەشێت پێدەکەنێتو دەڵێت:

– تۆ ئەو هەموو پلەیە دەبڕی ئەوجا دەبیتە هیچ. کەچی من هەر لە ئیجادەوە هیچم.

### ١٨-من وامزانی:

بێوەژنێك شوانێكی دەبێت ڕۆژێك شوانەكە لە نزیكیدا دادەنیشێتو دەنگێكی لێوەدێت. بۆ ئەوەی تێبچوڵێت تاچەپۆك دەگرێت لەسەری منداڵەكەی نێو كۆشی دەداتو دەڵێت:

— خۆرە چەرەت لێكەوێت ئەو ترەت بۆ كرد!.

چەند ڕۆژێكی پێدەچێت ئەوجارە شوانەكە دەنگی لێوەدێتو ناكاتە نامەردی شەپێكی حێل لەسەری منداڵە كەدەدات.

بێوەژن بەتوورەیی یەوە دەڵێت:. ئەیەڕۆ.. ئەوە بۆ لەو منداڵەتدا!؟

ئەویش دەڵێت:

— من وامزانی ئەوەی لەو ماڵە تڕ بكات شەپ لەسەری منداڵ دەدات.

### ١٩-مووێك بەقوونەوە ناهێڵێت:

پیاوێك چێلێكی بە ((كەڵ)) دەبێتو لەگەڵ كوڕە پارچەڵەكەی خۆی دەیباتە ماڵێك لەپەڕگەی ئاوایی جوانەگایان دەبێت.

خاوەن جوانەگایەكە دەڵێت:

— جوانەگایەكەمان ناپەڕێت.

ئەویش دەڵێت:

— من وادەكەم بپەڕێت.

موویەك لەقوونی جوانەگایەكە دەردەكێشێت، جوانەگایەكە دەپەڕێت، جاری دووەمو سێیەمیش هەر ئاوا.

هەركە دەگەڕێنەوە باوكە بەكوڕەی دەڵێت:

— لای دایكت نەگێڕیتەوە.

— بۆ..؟.

— بەحەقی خودا موورێك بەقوونمەوە ناهێلێت.

**٢٠-مێرووانێ:**

ڕۆژێك بەرێككەوت لەناو تەكسییەكدا، لەتەك پیاوێكی پیری هەشتا ساڵیدا سوار بووم. بێ ئەوەی بمناسێت هەر زوو گوتی:

— كاكە بزانە ژنێكم لۆ نابینییەوە.

منیش بەحەیرمانەوە گوتم:

— چیت پێماوە؟.

بێ سێ و دوو گوتی:

— نەخێر.

— ئەدی لۆ چتە؟.

بەبزەیەكەوە گوتی:

— مێرووانێی لەگەڵ دەكەم.

**٢١-میوانداری عەرەبی بەدو:**

سێ چوار كوردی ڕێبوار تووشی هۆبە ڕەشماڵی ((عەرەبی بەدو))ان دەبن و لادەدەنە ژێر.. ڕەشماڵێك.

سەیر دەكەن هەرچی مەنجەڵ و قاپ و قاچاخی ماڵەكەیە زۆر پیسەو پاشماوەی ((شیو))یان پێوە دیاربوو.

ئەوانیش بێزیان نەهات نانی بخۆن و دەچنە ڕەشماڵێكی تر. بەپێچەوانەوە هیرباریان زۆر پاك و خاوێن دەبێت.

دوای نان خواردن هەركە وێدەكەون خانە خوێیە نوێیەكە دەڵێت:

– ئەوان سەگیان نییە تاکو پاشماوەی چێشتی نێو قاپو مەنجەڵیان بلێستەوە، سوپاس بۆخوا ئێمە سەگمان هەیە.

## پیتی - ن -

١-ناگۆڕمەوە:

کابرایەکی دەشتەکی ڕانکێکی کۆن‌و دڕای لەپێ دەبێت.

پیاوێکی دیکەی مەفتووق شەروالی نوێ دەبێت‌و دەڵێتە دەشتیەکە.

— لۆ ناتێیت ڕانك‌و شەرواڵەکەمان بگۆڕینەوە.

— ئاخر هی جەنابت نووەو هی من کۆنە.

— من ڕازیمە.

هەرکەلە پێدەکەنەوە کابرای مەفتووق دەست دەداتە نیفۆنی ڕانکەکەو دەیەوێت، بەپێچەوانەوە لەپێی بکات.

دەشتەکییەکە دەڵێت:

— ئەوە چدەکەیت؟.

— دەمەوێت کەرخی قوونت بخەمە ڕاست کێرم.

دەشتییەکە تووڕە دەبێت‌و بەهەڵچوونەوە لەگەڵ گوتنی: ((

— سەی لەبابی سە، بەو نەوعەبێت لەگەڵت ناگۆڕمەوە)) .

ڕانکەکەی لێدەستێنێتەوە.

**٢-نانی بێخوێ و ترێی سوور:**

شەوێك لەتازییەی سەیدەکانی خوازام، لەگوندی ((جدیدە))ی ((بەڕانەتی)) مامەوە. کابرایەکی ناپووتو شمەك شڕو خراپو ڕیش بەنارێك هاتوو.و گوتی:

— فلان کەس نانی بێخوێ دەخواتو ترێی سوور= ((سوێر)) دەکات.

منیش ئەو قسەیەم لە ژیاندا یەکەجار بوو بەرگوێ بکەوێتو زۆر پێ سەرسام بووم و بەخۆم نەوەستام و گوتم:

— کابرا تۆ قسەت لەقەدەر بچمت یەك نییە.

بەهەڵچوونەوە گوتی:

— بۆ .. بچمم چییتی؟.

ویستی قسەی نارەوام حەوالە بکات، بەڵام یەك لە خوارزاکانم پێیگوت:

— ئەوە فلان کەسە.

ماڵی ئاوا بێت قسەکەی قوت داوە.

ئەو پیاوەش خوالێخۆشبوو: ((دەروێش سەلیم))ی گوندی ((قەتەوی))بوو. لەو ڕۆژەوە بووین بەدۆستو ناوە ناوە سەردانی دەکردین .

ڕۆژێك پێم گوت:

— وەزعی بەدەنیت کووە؟.

گوتی:

— کووبێ. پێشان پەلەمیزدم لەسەر سەری خۆم ئاوا دەکرد، کەچی هەنووکە هەرچەند هەوڵ دەدەم هەر بەگونم شۆڕدەبێتەوە.

**٣-ناوەللا:**

پیاوێکی یەختیار چایەی بۆ چەند کەسان تێدەکرد.

کوڕێکی گەنجی کۆڕەکە، قەشمەر باز بـوو دوای خواردنـەوەی چـایەکە پیالەکەی سەر نخـوون لەسـەر ژێـر پیالـە دادەنێـتو ملاکـیش لەسـەرو دەداتەوە چایە چییەکە.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

—ناوەللا بەقوزی دایکت نەرمو تەرترە لەقوونی من.

**٤-ناونووس = ((ئیحسا)).**

لەناونووسینی ساڵی ((١٩٧٧))دا من گـەڕەکی بـاداوانم بەرکـەوت.

چوومە ماڵێك تازە بۆ یەکەمجار کوڕێکیان بوو بوو.. باوکە گوتی: ((

—مامۆستا من ناوم ((حوسێن))ەو ناوی کوڕەکەشم ((سەدام))ە.

ویستم بنووسم ژنەکەی بەتوورەیی یەوە گوتی:

—نەخێر ناوی سەردارە.

کابرا دووبارە گوتی:

—ناوی سەدامە.

ژنە گوتی:

—ناوی سەردارە.

منیش گوتم:

—نازانم بەگوێی کیهانتان بکەم؟.

ژنەکە بەهەڵچوونەوە گوتی:

—کاکە کورِ کوڕی خۆمەو ناوی: سەردارە.

منیش گوتم:

— هەتا قسەی جەنابت دەشکێت ملی شەیتان بشکێت.

نووسیم- سەردار.

کابرا چاوی بە خۆدا شۆڕ کردەوە.

**٥-ناوی خواش ناهێنم:**

رۆژێك چەند کەسانێك بەمەلایەکی شیعە دەڵێن:

— پێنج ((٥)) هەزار دینارت دەدەینێ لە خوتبەی جومعەدا ناوی ((حوسێن)) مەهێنە.

— ئەگەر پەنجا هەزارم بدەنێ ناوی خواش ناهێنم.

**٦-نەخۆشێکی:**

لەزەمانی زوو دوو ژنە قەرەج ڕوو لە ئاوایی یەك دەکەن‌و یەکێکیان دەچێتە حەوشەی ماڵێك چۆڵ دەبێت‌و لە دەرگای ژووری ماڵەوە دەدات‌و دەڵێت:

— کێ لەماڵە؟.

تومەز ئافرەتی ماڵەکە چوو بووە کۆڵی دەشت‌و ئەو زەمانیش ژن‌و پیاو لەیەك دەستە شمەکی بەریان زیاتر نەبووە. پیاوەکە شەرواڵەکەی بۆ شۆرین بردرابوو.و ناچار بوو، هەتا بۆی دێتەوە خۆی لەژێر پێخەف نابوو. بەدەنگەکە دەزانێت ژنە قەرەجەو پێیدەڵێت:

— من نەخۆشم دەرگای بکەوە.

هەرکە پێ لە ژوورەوە دەنێت‌و پڕی دەداتێ‌و کاری خۆی لەگەڵ دەکات.

کە ئافرەتەکە دێتــە دەرەوە تووشــی هاوڕێیەکـەی دەبێـت و دەیـەوێت بچێتە ماڵەکەو پێیدەڵێت:

— مەچووە ئەو ماڵە نەخۆشێکی زۆر سەگبابـی لێیە.

٧-نەدەپچڕێ، نەدەبردرێ:

زەمانی زوو دۆم بۆ کاسبـی لە گوندەکان دەگەڕان. خێمەیـەك، دووان، هەتا چواریشیان، لەناوەڕاستی ئاوایی هەڵدەدا.

پیاوەکان بێژینگو سـەرەندو هێڵـەگو تەشـیو تـیزۆگو ناوبرێشـكو خوخولەو شتی تریان درووست دەکرد.

ئافرەتەکانیـان ئـەو بابەتانـەی باسـکران لـەناو ئـاوایی یـان دەگێـڕاو دەفرۆشت.

جارێك ئافرەتێکیان گەنجو کەڵەگەتو ڕەش ئەسمـەر، بەتـەنیا بـەرەو گوندێکی نزیکەی بیست ((٢٠))دەقیقە دوور لەو گونـدەی بارەگاکـەیان لێهەڵدابوو دەچێت. هەرکە دەگاتە دێیەکـە ئـافرەتێکی بەتەمـەنو دنیـا دیتە وەبەر گوێی هەڵدەدات:

— کیژم تۆ بەتاقی تەنێ لە ڕێیان ناترسێت؟.

ئەویش دەڵێت:

— لەچی بترسێم.

ئافرەتەکە دەڵێت:

— ئەوڕۆ شوان هەیە لەو دەشتە لەسەر کەرپاز نادات، لەسەر جـەنابت کوو پاز دەدات.

بە پێکەنینەوە دەڵێت:

- پلکێ چەرمە نەدەپچڕێ، نەدەبردرێ.

**٨.نفس الخری:**

لەزەمانی بەعسی گۆڕبە گۆڕچوودا، گەلی کورد لەسەیتەرەکان زۆر ئەزیەت دەدران. نەخاسمە سەیتەرەی ((شێراوە)). گوندێکە لەسەر شەقامی کەرکووك، باکووری شارۆچکەی ((پردێ))یە.

ڕۆژێك نێرینێك لەبەغداوە بەرەوشاری هەولێر دەچێت.

هەرکە دەگاتە سەیتەرەکە بەر پرسەکە بەنەفەرەکان دەڵێت:

- یاللا دابەزن.

هەموویان دادەبەزن تەنیا یەکێك نەبێت.

بەرپرسەکە پێیدەڵێت:

- بۆ دانەبەزیت؟.

ئەویش دەڵێت:

- من کوردنیم تورکم.

بەغەزەبەوە پێیدەڵێت:

- نفس الخری - إنزل.

**٩-نەکەیت سوورە نەکەیت:**

سەردەمایەك ژنە ڕەوەندەکان بۆ گەنگرو ڕێواسان لە کوێستانەکان بەکۆمەڵ دەگەڕان. هەرکە تووشی پیاوێکی ڕێبواری لابیدە بهات بوونایە، بەسێ چوارێکیان دەیان گرتو بەرزەفتیان دەکرد و شەڕواڵیان لەپێدەکردەوە.

ئافرەتێکیان کۆشی خۆی هەڵدەماڵی و عەورەتی پیاوو ژنەکەیان بەرامبەر یەکتر.. ڕادەگرت و شەپلە قوونانییان پێدەکردن.

ئەگەر عەورەتی پیاوەکە بجوولابووایە، بەسەلکە شەکرۆکان لێیانەدەداو دەیانگوت:

—نەکەیت سوورە نەکەیت.

.......................................

شەکرۆکە - کەرتەشی. گیایەکی بەهارییە و دڕکاوییەو نێرکێکی باریکی بەرزی هەیەو سەرەوەش تۆپێکی دڕکاوییە.

۱۰-ئەینۆک:

ڕۆژێك چوومە شار، لۆ ئەوەی هاوسەرەکەم دڵخۆش ببێت ئەینۆکێکم بە دیاری بۆ کڕی. دەمزانی بەعەمری خۆی ئاوێنەی نەدیتووەو ناشزانێت چییە. هەتا بزانم کە یەکەمجار خۆی لەناو ببینێت چ دەکات، بەئەنقەست لەناو سەندووق، بەرامبەر دەرگام دانا. کاتێك دیتم لەگەڵ دەرگا کردنەوەی سەندووقەکە لە زرووکەیەکی وایدا بەندی دڵمی پساندو لەبەرخۆمەوە دامە بەر مەزەندانو : ((

—ئیللا بیللا بچمی خۆی بە ئەجندەی خەملاندووە. ئەگەرنا ئەوها.. نەیدەزرووکان)) .

بێ ئەوەی زاری لەگەڵم بگەڕێت بەلەخۆدان و ڕوو ڕنینەوە بەرەو ماڵی بابی، کە دراوسێمان بوو هەیپەی لێکرد.

من ئەوەندەی لە خەسووم دەترسام، ئەوەندە لـەخوا بترسـابوومایە بـە پێڵاوەوە دەچوومە بەهەشت. لەو گۆڕە زەندەقم لێی چـوو بـوو، ئەخەسـەلە ئەو قەباحەتەشی بێتە پاڵ . ((بەحەقی خودا حەیام دەکاتـە حـەیای پیـاز فرۆش)) مەولوودێکی گەورەم لە خۆم گـرت، ئـەو کەڕەتـە بەسـەلامەتی لەدەستی قوتارم. دیتم وا لەپێشەوە بەهەلە داوانەوە دێت. ویستم پێش کار لە کارترازانێ، بە پیریەوە بچمو لە واریقاتەکەی حاڵی بکەم، بەڵان هـای.. هوو.. لەجاری ئەوها هەڵچوونیدا، گوێ بەباوکی خـۆی نـاداتو هـەر لـە دوورەوە بە دەنگێکی حیلو پڕ غەزەبەوە گوتی: ((

—قورە مـەیتـەری سـەیانی لەچاو پیاوان دەڵێیت چوشتیری بەراویشـتـەی تۆ هی ئەوەی ژن بەسەر کیژی من بێنیت!)) .

هەرکە ئەوەم لێ بیست بۆم واژی بووەوە: ((

— کەر لە کوێ کەوتووەو کوندە لـەکوێ دڕاوە)) : خێزانەکـەم ڕەسمـی خـۆی بـە نـافرەتێکی دی لەقەلـەم داوە. پشـووی ئۆخـەم هاتـەوە بـەرو مچوڕکەی خۆشی لەناو شادەمارەکانی جەستـەمدا مێروولـەی کـردو بـە پێکەنینو سێ جرتی لەخۆ هەڵداندا بەدوایان کەوتم:

حورمەکەم بەدایکی گوت: وا لەناو سەندووقی داناوە.

لەگەڵ کردنەوەی دەرگای سـەندووقەکەو دیـتنی شـێوەی خـۆی لـەناو ئەینۆکەکەدا، لە حریتەیەکی وایدا لە دوورەوە دەبیسترا.

من وای بۆچووم پێشتر ناوێنـەی بینیبێـتو هـەر زوو ڕووی بەلامـەوە، وەچەرخاندەوەو بەزمانی خەسوواتییەوە گوتی:

—ڕۆڵە ژن لەدنیادا قات بوو بێنیت تەنیا ئەو پیرە سەیە نەبێت.

١١-نووسەر:

بێوەژنێك كچێكی زۆر جوانو تەڕوبڕی هەبوو. بڕیاریدا كچەكەی. لەبەر ئەوە نووسەر بێ ماندوو بوون و كاسبی حەڵاڵ پارەی لەملاو لەولا دەست دەكەوێت بداتە نووسەرێك. ئیتر نووسەرێكی بەدڵ كەوت كیژەكەی گوازرایەوە.

دوای هەفتەیەك، دووان بووك بۆ باوەخۆون گەڕاوەو دایكی لێی پرسیو.

—ها.. كچم چتۆ مێردە؟.

بەدڵساردییەوە گوتی:

—لەبەر نووسینی كاغەز هێشتا دەخلی منی نەكردووە.

هەفتەی سێیەمو چوارەشم هەر ئاوا.

دایكەكە زۆر پێ دڵگیر دەبێتو دوای مشوور خواردنێكی زۆر پێیدەڵێت:

—ڕۆڵە ئەو شەو هەركە خەریكی نووسین بوو تۆ ئاوەڵكراسەكەی خۆت لەپێ بكەوەو هەردوو لینگت بەرامبەری قوچ بكەوە ئەوسا هەركە سەربەرزكاتەوە، بەدیتنی زەوقی هەڵدەستێت:

هەركە شەو داهات خەسووەكە دەچێت لەكونی دەرگاوە تەماشا دەكات. كاتێك دیتی نووسەرەكە سەری بڵندكردو دەستی بۆ درێژ كرد.

دڵنیا بوو.و گوتی:

—تازە كار لەكار ترازا.

گەڕاوە.

بۆ بەیانی دایكەكە گوتی:

– ها.چ بوو؟.

– هیچ.

– کچێ بەخۆم بەو چاوانەم دیت دەستی بۆ برد.

بە پێکەنینەوە گوتی:

– کچێ پەنجەی پێ تەڕ کرد تاپەڕی کاغەزی پێ ئاوا بکات.

**١٢-نێرە کەرە دیزە:**

سێ چوار تەنەکە مێوژمان هەبوو ڕۆژێك خستمە سەر پشتی نێرەکەرە دیزەو لە دێهاتەکانی دەورووبەر، بۆ باراش بیفرۆشم، ڕۆژی یەکەم لەبەیانییەوە هەتا ئێوارە گەڕام هیچم بۆ نەفرۆشرا. ڕۆژی دووەم و سێیەمیش هەر هیچ.

((سۆزێ))ی خێزانم بەڕوومدا هەڵشاخاو گوتی:

– ئەرێ پیاوەکە تۆ بەناو ئەواسەری سێ ڕۆژانە ئەو مێوژەی دەگێڕیت ئەوجا هێشتا کێشێکت نەفرۆشتووە!.

– ئافرەت چیت لێ بشارمەوە نێرە کەرە دیزە لێناگەڕێت بیفرۆشم.

باوەڕی نەهاتو بەدرۆی حەملاندو گوتی:

– پیاویژگە قسەیەك بکە خەڵك پێت باوەڕ بکات.

– حورمێ بەو ڕدێنە سپییەمەوە درۆم هەڵنەبەستاوە.

بەهەڵچوونەوە گوتی:

– ئەدی کەرخۆی هەیە هەتا نەیەڵێت مێوژ بفرۆشیت.

هەر ئەوسات مێوژەکەم لەسەر پشتێ نێرەکەرە دیزە داناو قەوچیم گرتو بردمەوە دەرەوەی حەوشەو گوتم: ((

— دەتەماشاکە )).

هەر گوتم : ((

— هۆ..ی مێوژ )) نێرەکەرەدێزە یەکسەر دەستی بە زەڕین کرد هەتا من سکوتم نەکرد ئەو بۆ سانییەکیش نەیبڕییەوە.

بۆ دڵنیایی دووەم، سێیەم جاریش ناوا.

ئەوجا ڕووم تێکرد و گوتم:

— ئافرەت خۆ حاڵی بوویت. لەبەر زەڕەی دێزە هیچ کەس تێمناگات من بانگی چدەکەم تاکو بێن لێم بکڕن.

زەردەیەکی تەڵخی هاتێ و گوتی:

— دیارە نێرە کەرە دێزەی ئاخری زەمانە.

عەنتیکە لێرەدایە: لەباشووری کوردستان دەنگی شێخەکان هەردەم بەسەردەنگی کەسانی ڕۆشنبیرو نیشتمان پەروەراندا زاڵە.

## پیتی - و -

### ١-وەحەی دڵداری:

لە هەڕەتی مۆزە مـۆزی لاوی دابـووم‌و کـوڕێکی کـۆک‌و چوارشـانەو تێکچەقی‌و تا دەست هەڵێنێت باڵابـەرزو دیـدە گـەورەو مـەڕانی‌و لـووت بەرزی واشام بە سـەپانی خـۆم نـەدەزانی‌و لـە هـەموو دەراوێکـیش ئـاوم نەدەخواردەوە.

زۆربەی کیژۆکاری ئاوایی خواخوایان بوو خـۆم لەقـەرەیان هەڵسـووم، ماڵی حەزی دڵ خراپ نەبێت، ماری بـی ئیجـازە بـوو.و بەخـەیاڵیش بـۆ شتاقیان دانەدەوەراوەو بگرە بێزم نەدەهات بەتی چاوێکی کەمیش سەیریان بکەم و لەدڵەوە: ((

—تـۆ خـوا مـن‌و ئـەو گیسـکە بەراویشـتانەیان گوتـووە)) . تـەنیا یەکێکیان نەبێت ئەویشم بەگۆمکی گۆپاڵ، لەنێو چەندین کیژانی ئاواییم نیشان کردبوو. کە حێلێك بوو بۆ خۆی: تەبەش پان‌و قولەمس‌و چاوشـینی کۆتری. کولە گوپن، پەنجە گۆشـتن. خـوێن ئەوەنـدە شـیرین بەحـەزی دڵان بووایـە ((لەیسـتۆك)) ئاسـا تـەنیا بۆسـێرەگرتن لەسـەر ناولەپـدا ڕابگیرابووایە.

گەردەنی کتو مت گەردەنی کارمامزی دەشتی قەراجو کەندێناوەیە کاتێك لەنێو قۆپانە دەغڵان سەرهەڵدەبڕێت. ئەو فرشتە بێ هاوتایە بەجارێك ئاگری تێبەر دابوومو کاسو سەرخۆشی وای کردبووم تەرحی سپیانێکی نەبان کە ((بانۆك)) بۆ باناندنەوە لەسەر بەرخەکەی گێژو هوری کردبێت، خراتریشم لێهاتبوو. وێنە شەنگە دلڕفێنەکەی لە خەیاڵو ناخی دڵمەوە سانییەك چییە نەدەپەڕی.

ئەخاسمەشەوان هەتا سێباری دەچوو خەوی لەچاوانم دەهاڕماندو گەوزانی بەملاو بەولای پێدەدام . زۆرجاریش دەهاتە خەونم و بەنازو نووزو جرت کێشانی دووراو دوورەوە پێمدەتریقاوە.

وامدابووە بەرمەزەندە: (( دڵ ئاگای لەدڵەو بێگومان ئەویش منی خۆشدەوێت)) کەچی لەم ڕووەوە خوا هەر لە نیجادەوە پەردەی حەیاو شەرمی بەسەرمدا هەڵکێشابوو بەهیچ کلوبابەتێکەوە تاسام نەدەکرد، لە ئاستیدا جیڕ بەجیڕی بکەمو هەستی دەروونم بە ڕوویدا هەڵێنمو بڵێم: ((
– گیانەکەم پڕ بەدڵ تۆم خۆشدەوێت)) . نیشارەو بڕۆ هەڵتەکانیشم لاسوخەتێکی قەڵبو تڕووهاتی تڕۆیان بوو.

تەنیا کە بەکنیدا گوزەرم دەکرد تێم هەڵدەکردە ((نحم))ێکی گەورەو بەس، یاخۆ، کەڕوو بەڕووی دەبووم بەبافرەو سمێڵە خچکەوە لێی موورِ دەبورمەوە. ئەوکات هەستم دەکرد گەشییەك ڕووە تۆکمەکەی دادەگرت. ئەمەش بۆ دڵە گڕگرتووەکەی من مەرهەمێکی کاریگەر بوو.و لێمدەبووە مچوڕکەی خۆشیو لەنێو ماسولکەکانم ڕمبازی دەکرد.

هەرکە لێی دوور دەکەوتمەوە لەخەنی خۆشیان هەرچی ئازای لەشم بوو دەکەوتە جیهانی لەخۆهەڵداتی جۆنیانییەوەو لاموابوو دنیا سەرتاپا بووەتە موڵکی من.

ئەوجا بەداخەوە بەهیچ چەشنێك نەمدەتوانی بە ئاکامی دڵی خۆم بگەم. ناوەللا. زرتە بۆزەکەی باوکی تەلاقی سێ بەسێ پێدادابوو: بێ ژن لەماڵ دەرناچێت. خواش خوشکێکی نەدابوومێ تاکو ژناو ژن ڕازیم بکردبووایە. هەبووەش نیمە بەزەبری پارە لەبن چنگیم ڕاستاند بووایە. هەردەم لەکێشمە کێشی ئەوەدابووم هانا بۆچ ڕێگایەك ببەم: ((ئێ..خۆ ناشکرێت هەر ئاوا دەست بەتاڵ لەسەر تاوو تاگرم‌و تەکانێك لەخۆم نەدەم)) .

دوای هەڵگێڕو.. تەتەڵەکردنی چەند ڕۆژو شەوان وام بە باش خەملاند: هەڵی بگرم. بەڵێ هەڵی بگرم. لەمە زیاتر چ ڕێگەی دیکە شك نابەم. نەبەخوا. بەڵێ چارە تەنیا هەڵگرتنەو بەس. هەڵیدەگرم تاکەس جێمان پێنەزانێت دەچینە ناوعەرەبان. ئەمەش خستمیە کۆڕی بیرکردنەوەیەکی زۆر و: ((

—ئێ.. خۆ هەڵگرتنیش گۆترە نییەو محاڵە بەکت‌و پڕی ببێت. لەبەراییدا مشوور خواردنێکی زۆری گەرەکە. باکیژەش من خۆش بووێت. ئاخر من هەتا ئەمڕۆی حازری بەچاك‌و خراپ، پڕ بە زار نەمدووانەدووە و چۆن‌و بە چ ڕێگایەك بۆم دێتە ڕایێ. نەخەسەلە کچێکی نابرووممەندی لادێی‌و شاران نەدیتە ئەمە هەرگیز نەبووەو ناشبێت. ئەی تەکبیر؟. قوڕی کێندەر بەسەری خۆم دابکەم‌و چ ڕێگایەك بگرمە بەر خوایە! )) .

کەوتمە نێوان چاڵان و ماڵانی دوورودڵییەوەو: ((

— خۆ ئەگەر بێتو خوانە خواستە بەنسیبم نەبێت ژیانم ئەوسا بێگومان لێدەبێتە ژیانی ((سامیری))و کەڵکی ئاوەدانیم هەرگیز نامێنێت. ناوەللا کەڵکم نامێنێت)). ناحەقیش نەبووم ئەوا سەر لە چوار ساڵی ڕەبەق دەدات ئەوینی ئەوبابان کوێرەی لەسکۆڵەی چەپی دڵمەوە واقرمساوە هێز نییە لە جیهاندا، هەتا ئەودەمەی حەزرەتیو ((قابیز)) چۆك لەسەر سینگمدا دەنێت بە ئاستەمیش بیشلەقێنێت. جا خوانەکەرانە بەیەکجاری لەکیسم بچێت و بەزەقە زەقی چاوانم سەر لە باخەڵی گەمبۆرێك بنێت. هەرچەند سەرم دەهێناو دەبردو لەدڵەوە شیکوتم دەکرد لەو ڕێگایەی گوتم بترازێت زیاترم بەخەیاڵدا گوزەری نەدەکرد. ناچار خۆشیو ترشی ملی بۆ لاربکەمەوە، بەڵام لە سەراپیدا دەبێ هیچ کۆسپەو گرێو گواران لەم ڕووەوە نەهێڵم و تەختی بکەم. ئەوکات مشوور خواردنی قوڵو باسك لێهەڵماڵینی سانایەو گیرو گرفتمان نایەتەسەر ڕێگا.

لەپەڕەکەی دڵمەوە بڕیارمدا کۆششی لەمەودوام دڕاندنی پەردەی شەرمی نێوانمان بێت. بەڵێ: دڵدارییەکەمان وابتەقێتەوە خەڵك و خوا هەست پێ بکەن. ئەوسا لەترسی ئابڕوو چوون و کوشتندا، بەخوایشتی دڵمانەوە ئەو ڕێیە دەگرینەبەر. ئیدی لەو ساتەوە چاوە چاوی ڕۆژێك بووم لەپەنایەکی نەدیو بۆم تیبێتەوەو چی ڕازی چوار ساڵەی دەروونمەخرێ، لەسیری هەتا پیازی بە ڕوویدا هەڵڕێژم.

ڕۆژان هات، ڕۆژان ڕۆیشت ئەو پاتەم بۆ نەڕەخسا. لە بەختە دمۆرەکەی مندا ئەو لەو ماوەیەدا تورێندییەکی وابوو دەتگوت پێ

حسیایە. بەهیچ کلۆجێکەوە بۆم تێ نەدەبووەوە. تاکو ڕۆژێك، وەك سروشت مەیلی لەسەر بێت کتو خوادیتم لەتەقرانەکەی بەردەرگەی حەوشەیان، کە ڕێگەی گشتی بە سەرەوەبوو. وا بەتاقی تەنێ ((باراش)) چنا دەکات. لەبەر گەرمی ڕۆژەکەوە. دنیا کش و مات کێشکە چییە بەدەرەوە نەبوو. دەلحاز شادی دایگرتم. ئەما شادی . دڵە هەڵقرچاوەکەی حەیام زەمانەوە کەوتە هەلەکە سەماوەو: ((

—شێروان دەی خێراکەو خۆت مەگنخێنەو غیرەت بدەبەر خۆتەوە غیرەت . جارێکی دیـ گورگ ئاوا بەسەر ((سەدە))ی مەحموود بایزدا نایەتو دەرفەتێکی ئەوها لەبارت بۆ هەڵناکەوێت)) .

وارە وارە بە بزەی سمێڵەوە بۆلای خشیمو کەوتمە نێو گێژاوی ((چی شایەنە پێی بڵێم)). لەلایەکی دیکەوە لەگەڵ هەرهەنگاوێك شەرم هورووژمی بۆ دەهێنامو ئاگام لێبوو دڵە کوتە گرتمی. ئەو دووانە لەناخی دڵمەوە خنگە ملانێیان بوو.

هەریەکەیان خۆی لە ئەوی دی بە ڕەواتر دەحەملاند.ئەویان ڕێخۆشکەری ئارقابوونی ئاواتە توریندەکەم بوو کەنرخی هەرگیزاو هەرگیز تەواو نەدەبوو، کەچی ئەمیان ماخۆ مردەجلەوی لەدەست خۆمدا نەبوو. و بێویستی حەزمەوە هەر دەهات پەرەی دەستاندو هێندی هێندی سەیتەرەی لەسەر دەکردم. لەوبینەو بەردەی دوودڵیەدا بووم کاتێك گەیشتمە قەرەبە قەرەیو شەرمەکە لێم بوو بەترسێکی یەکجار زۆری وا چۆکەکانم لەرزینو دەتگوت لە کەلێنی دزی گیراومو بەسەر هەستو هۆشمدا زاڵ بوو چەشنی نووشتەی زار بەسترانم لێکرا بێت مردمو سۆتم لە نحمەکەی تایەن بترازێت

دەمم بۆ چیتر نەپچڕا. ماوەیەك لێیدووركەوتمەوەو لە ناكاوێك مەرامەكـە ، سەربادانی پەشیمانیو نەفرەت كردنی شەیتانی لەعین شەرمو ترسەكەمی توورِ هەڵدانو ڕووی بەسـۆزەوە چوسـت پێـوە چـەرخاندمەوە. لەحیـددەتی قـارخواردنی بـێ غیرەتـیو قەڵـە زراوی خۆمـەوە سەركەشـانە شـەقاوی جەسارەتیم زلو گورج تر دەهاوێشتو: ((

—عـەمرت نـەمێنێت خـۆ چ مەیـدانی زەلام كوشـتنێ نییـە غـیر ئافرەتە!)) . هەنووب هەر كەگەیشتمەوە كەرخی زارم بەهەمان شێوە گیراو مردوسـۆتم بـۆم نـەترازا تـەنیا بـەس بڵـێم: ((ئـەرێ كوویـت)). جـاری سێیەمیشی چووە پاڵ . ماسەر كۆنەی خۆم بكەم و: ((

—دەگ داوەشێیت . دافەتییێت. غیرەتت سەگ بیخـوات. ئـــ..ه كەبێتـە قسانیش بەخۆت دەڵێیێت پیاو . ئەوجا ئەوهاش زێلك ڕژاو. خـۆ هێشـتا چ نەبووە وا تۆقیویت. ئـەی ئەگـەر گەیشـتیتە.كاری لێقـەومانێ؟. لـەجێی ژووان، یان لەكاتی هەڵگرتنیـدا جـەنابتیان دیـت. ئـەوكات دەبـێ چـی بكەیت و چیت بەسەر بێت؟)).

ماڵی ((نەخشین خان)) ئاوا بێت لەبەر عوجب گـەورەیی بێـت، یـان هەر شتێكی دیكەوە، بـە تحمـەكان خـۆی كـەمو زۆر لـە گوورەنـەدەبردو مرتەی بۆ سونەتیش لەبەرەوە نەدەهات. لەناخەوەم سەقادرا بێدەنگییەكەی نیشـانەی ڕازی بوونـە. ئەگـەرنا دەسـبەرداری كارەكـەی دەبـوو.. و خـۆی لەحەوشە دەكوتاوە.

ئەمە خۆشییەکی لە رادەبەدەری پەڕاندە دڵە بێ ئۆقرەکەمەوەو زۆر نەمابوو جاشکانی لە خۆم هەڵدەمو بەپاشیان زرچە لە سمتەکانمەوە بێنم. هەرچی شەرمو ترس بوو بەجارێك لەناخمەوە بارگەی تێکناو: ((

— کە کیژە پێیخۆش بێت تۆ لەچ دەسەنگرییتەوە ها..؟ )).

وێڕای ئەمەش سوێندێکی مزرم: ((وەلـلا وەبـیللاوە تـەللا ئەگـەر بشپسێم ئەو کەرەتـە بـەجێی دەگەیـەنم))، پێدادا، دیسـان بەشـەوق‌و هەشتاوییەوە گەڕامەوەو دڵنیابووم دواجارەو شتێك بەشتێك دەکـەم. وەك ئەسپێکی خورت بۆ قۆشمە، لەسەری مەیدان وەستا بێت. بەدەنم ئاوا گشت کەوتە دنیای چرك‌و هۆڕەوەو ڕەنگم بـەجارێك بزرکـاو رنگـە رنگـی دڵـم دەتگوت ((لاوژۆکە))ی زەنگۆڵی ملی بارگینی کاروانچیانە.

ناحەقیش نەبووم دەربڕینی هەستی خۆشەویستیەکی پـەنگ خـواردەی چوارساڵەی ڕەبەقی ناخی سکۆڵەکانی دڵمەوە، بە یەك ڕستە گۆترە نییە.

هەر کە لێی نزیك بوومەوە لەبەر سێرەی سۆماکانم بوو بە پیـاوێکی زەبەلاحی واسەری لە کەشکەلانی حەواوەو سامی بەسەر هەست‌و هۆشم دا زاڵ بوو.و هیچی لەیاد نەهێشتم، کەچی سوێندەکەم هاتەوە زەین‌و تۆزێك گوڕی غیرەتی وەبەرنام‌و نەیهێشت جاران ئاسا دەسـت بـەتاڵ بگەڕێمەوەو ئحمەکە بووە پێش قەرەورو بەڵام چەندی کردم‌و کۆشام لەمەم زیاتر نەهاتە سەر زارو لە ڕاستیشدا لەبەر ئەوە بۆ کەرەتێکی تـر شـەرم‌و تـرس ڕەوێـن دەبێت ئەوەندەم کەیف پێهات لاموابوو کێوی بێستوونم سمیوەو: ((

— دەڵێم بە جارێك ئەو هەموو گەنمەت لێ بخۆم! )) .

بە ئاوڕدانەوەیەکی سرکی ئاسکانە، لە حیلکەیەکی وایدا لــە دوورەوە دەبیستراو لە دڵمی زاخاودا مەزەندەکــەم بەهەڵــە نەچــووەو خۆشــیەکی وا دایگرتم دووباڵی شادیو کامەرانی لێرسکاندمو لەکەشــکەلانی ئاسمانــەوە باڵە فڕکەم بوو.و پشوویەکی درێژی سەرفرازیانەم خواردەوەو : ((

— ئۆخەی خۆ.. وا لەزگە بەنیازی دڵە بــێ ئۆقرەکەی خۆم بگەم. ئــەدی چت دەوێت شێرە!؟)).

کەچی بەداخەوە لە هیکەوە ڕیسە کشتەکەی چــەند ســاڵەم بــەجارێك لێبووەوە بە خوری و چاوی تەمابڕانم مۆڵەق وەستاو قــورگ وشــكو زەردەنــد ئاسا تاڵو پشوو سوارو ڕەنگ زەعفەرانی کاتێــك پێکەنینەکــەی کــەمێك هێور بووەوە ئەمــەم بەدەنگی حێلی بــێ پەردەوە لێ بەرگوێ کەوت:

— وەحە هەرە.

.....................................................................

دوو تێبینی:ـ

١. ئەمە فۆلکۆرەو لە منداڵییەوە وام بیستووە: ((

کوڕە گەنجێك بەکن کچێك باراش چادەکات تێدەپەڕێتو شــەرم دەکــات بڵێت ((تۆم خۆش دەوێت )) لەجیاتی ئەمەی دەڵێــت : ((دەڵــێم ئەوەنــدە گەنمەت لێ بخۆم)) . کیژەش بە پێکەنینەوە دەڵێت: ((وەحە هەرە)).

منیش بەم چەشنەم داڕشتووە.

١- لەڕۆژنامــــــەی ((خــــــەبات))ی ژمــــــارە ((٤٠٥٤))، ڕۆژی((٢٧/٤/٢٠١٢)) بڵاوکراوەتەوە. ئەوەنــدە هەڵــەی چــاپو .. وشــە گۆڕانی تیداکرابوو بەهیچ شێوەیەك بەنووسینی من نەدەچوو.

٢-وەقیس:

خوالێخۆشبوو: ((مەلا عەلی لاودر)) جگە لە دۆستایەتیو یەك ماڵی خێزانییەوە گیان بەگیانی یەکتر بووین.

چەند بڵێی قسەخۆشو نوکتەچی بوو. لەگەڵ خوالێخۆشبوو: ((مەلا حەمەد ئەمینی مام بایز)) لە حوجرەی ئێمەیان دەخوێندو نێوانیان زۆر خۆشبوو.

ڕۆژێك مەلا حەمەدەمین پێیدەڵێت:

- بەخوا بابە: پەنجەکانی دەستت درێژن!.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

- وەقیس عەلەیهیل بەواقی.

٣-وەك بەری دەست:

لەتەمەنی حەوتو هەشتساڵ دا دەبووم، ڕۆژێك ((عەتار= پارە بەهێلکە)) یەك هاتە ئاوایی.

بێوەژنێکی تەڕوبڕ: ((ناتوانم ناوی بێنم)) چووەلایو پێی گوت:

- دمکانت هەیە؟.

ئەویش گوتی:

- بەڵێ.

هەندێکی لێکڕیو جا گوتی:

- چۆنە؟.

- وەك بەری دەستی لێدەکات.

- دەهەندێکی دیشم بدەرێ.

٤-وەکی ئەو براژنە:

کابرایەك دەچێتە بەغداو زۆر لە مەلهەو قاحپەخانان رادەبوێرێت.

هەر کە خەڵکەکە لێیدەپرسن:

—بەغدا کو بوو؟.

بێوەژنێکی تەڕو بڕیش لەلایەن دەبێتو دەڵێت:

—وەکی ئەو براژنەی بە ((٥))هەزارت دەگا.

٥-وەڵڵا ئەگەر:

ئافرەتێك لە نێو یەك لە عەشیرەتە کوردەکاندا رۆژێك بۆ هێلکە دەرهێنان سەری دەباتە ناو کۆڕیتی مریشکان. پیاوێکیش لەپشتەوە ئیشی خۆی لەگەڵ دەکات.

مێردەکەی پێیدەڵێت:

—واتە فلان تۆی گایە؟.

ئەویش دەڵێت:

—وەڵلا ئەگەر سەرم لەناو کورێت نەدەبوو ئەژدادیشی حەدی نەبوو ئەمن بگێت.

٦-وەڵلا هەر ئەوم:

پیاوێك لە کۆڵانێکی نێو بازاڕی شاری هەولێر تووشی کابرایەك دەبێتو لەدوورەوە بەگوراح خۆشیو پێکەنینەوە بەرەو پیریەوە دەچێتو لەگەڵ دەست ماچ کردنیدا دەڵێت:

—خاڵە ماندوو نەبیو......................

کابرا خۆی لە گوورەناباتو نایەڵێت تەواوی بکاتو دەڵێت:

– ببورە رۆڵە من خاڵت نیمە.
ئەمە پیاوەکەی سست دەکاتەوە.
دەسووڕێتەوە کۆڵانی دووەم تووشی دەبێتەوەو.. وەك جاری پێشوو لەگەڵ دەست ماچ کردنیدا دەڵێت:
– وەللا خاڵە تازە تووشی یەکێك بووم کتو مت جەنابت بوو.
بەپێکەنینێکی تەوساوییەوە دەڵێت:
– وەللا هەر ئەوم.
.................................................
ئەمە لەشار هەولێر ڕوویداوەو ناتوانم ناویان بهێنم.

### ٧-وەللاهی حەقێتی:

پیاوێك ژنەکەی ئەمری خوا بەجێدەهێنێنت. زۆر هەوڵ دەدات ژنی بە نسیب نەدەبووەوە. ڕۆژێك چووە ماڵە دراوسێیەکی و نێرەکەرێکیان هەبوو.. و دەستی بەزەڕین کردو داشنە دەسەکناوە.
خاوەن ماڵ پێ هەراسان دەبێت و دەست دەداتە خوترەیەكو بۆ ئەوەی سکوت بکات تۆزێکی داپەلۆسێت. کەچی بێوە مێردەکە دەیگرێتو پێیدەڵێت:
– کوڕە لێیگەڕێ وەللاهی حەقێتی پتریش بزەڕێت.

### ٨-وەللاهی سودگ:

دکتۆرێك پیاوێکی عەمەلیات کردو سستەرێك بەردەستی دەکرد. پیاوە نەخۆشەکە عەورەتو کەپووی زۆر گەورە بوون.

پزیشکەکە بەخۆشی لووتی گەورە بوو.و بەسستەرەکەی گوت:

— هەر پیاوێك کەپووی گەورەبوو شتەکەشی گەورەیە.

هەر ئافرەتێك دەمی گچکەبوو شتەکەشی گچکەیە.

سستەرەکە هەرزوو دەمی خۆی گچکە دەکاتەوەو دەڵێت:ـ

— وەللاهی سودگ.

٩-وەی بەوەی:

بێوەژنێك نەخۆش دەبێت. تاکە کچەکەی کاروبارو کۆو.. وژی ماڵەوەی بەڕیوە دەبرد.

بەیانییەکی وەرزی بەهارەو تازە دەهات ڕۆژ هەڵبێت کیژە لە خـوارەوە مەشـکەی دەهەژانـد. دایکەکـە لەسـەربان سـەیری خـوارەوەی کـرد.

نێرەکەرێکیان هەبوو لەسەر ئاخوڕی نێو حەوشـە بەسـترابووەوە عـەورەتی دەرهێنابوو.و ناوە ناوە لەبن زگی خۆی دەدا.

کچە هەرجارێ لەگەڵ نق لێدانی مەشکەو هەڵبەزو دابەزی عـەورەتی نێرەکەرەکە دەیگوت:

— وەی بەوەی وەی بە وەی.

دایکەکە لەدڵی گران دەبێـتو ئـاخێکی کەسـەراوی هەڵکێشـاو لـە ناخەوە پڕتاندی‌و گوتی: ((

ئای.. منداڵی ئەو زەمانە چەند بـی ڕەحمن، جارێ ناڵێت بەهی دایکە نەخۆشەکەم تاکو شیفای لۆ بێت هەر زوو خەمی نەفسی خۆیەتی)).

## پیتی - ھ -

**١-ھازەلتیز عەلا ڕاسی ((ھذا الطیز علی رأسي)):**

کابرایەکی عەرەب لە ئاودەستی مزگەفتێك ھەرچەند تەکان لەخۆی دەدات گووی دەرنایەت.

یەکێکی تر لە ئاودەستەکەی تەکییەوە ھەر کە دادەنیشێتو شیڕەی لێوە دەھێنێت.

عەرەبە کە گوێی لێدەبێتو دەڵێت: ((

—ھازەلتیز عەلا ڕاسی)) .

**٢-ھاوار بۆ ئەو میللەتە:**

کابرایەك منداڵێکی ناوە ناوە بۆ یەکێك لە خەلیفەکانی عوسمانیان دەبردو سواری دەبوو. ھەرکە منداڵەکە گەورەبوو.و کەڵکی گانی خەلیفەی نەما گەوادەکەی کردە ئەمیری شارێك و کوڕەکەش قازی.

ڕۆژێك قازی دەست بەگریان دەکاتو بەھیچ کڵو بابەتێکەوە کڕنەدەبووەوە.

ئەمیر دەچێتە لایو پێیدەڵێت:

—پێمنالێیت بۆچی وابە کوڵ دەگرییت!؟.

ئەویش دەڵێت:

—هاوار بۆ ئەو میللەتەی گەوادو قوندەر حوکمیان بگێڕن.

**٣-های وێن دیچ وێن:**

کوڕێکی گەنج و قۆزو بەکەشخەو پۆشاك نوێ و شام بە سەپانی خۆم نەدەزانی . لەشەقامی ((ڕەشید))ی بەغدادا وارە وارە پیاسەم دەکرد. دیتم: چەند کەسانێك لەبن ((قەتعە))ی ((ئامانە)) ڕاوەستاون. کچێکی زۆر جوان، نەبکەیت، نەبخۆیت هەر تەماشای بکەیت. لەپەرگەی لای وێروەیە. دڵم یەکسەر بۆی بزواو بە ئومێدی گفت و لفتێکەوە خێرا خۆم گەیاندە تەکییەوە و بۆ ئەوەی ئاوڕم لێ بداتەوە هەرکە گوتم ((نحم)) بیلامانا دەنگێکم لێوەهات.

نەبادا کیژە گوێی لێبوو بێت، هەتا تێ بچۆڵێت: پاشپانی قۆندەرەکانم بەقاییم لەیەك خشاندن.

عەرەبێکی بەختیاری ئەوسەری ڕێزەکەوە، بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی:

—لا..یابەلا.. های وێن دیچ وێن.

**٤-هەتادەو پێیبووێت:**

بەپیرێژنێکی هەشتا ساڵی و چاوکزو سەر لەرزۆکیان گوت:

—پووری دامێنت هەوەستی ماوە؟.

ئەویش دەڵێت:

—بەڵێ.

—تۆ.و ئەو تەمەنەو هەوەستیان گوتووە!.

بەپێکەنینەوە دەڵێت:

— هەتا دەو =((دەم)) پێیبووێت ئەویش پێیدەوێت.

**٥-هەتا دوو گونان:**

کیژێك داخوازی زۆر دەچێت، بەڵام لە ئەنجامدا نسیبی هەڵناقەندرێت. ئیتر بووە قەیرەکچی ماڵە باوکی.

ڕۆژێك داخوازی دەچێتو مارە دەکرێت.

کیژە دەڵێت:

— من لەبەر ئەوە زۆرم ڕك لەدرۆیان دەبێتەوە پێم خۆش نییە درۆم لەپێش بکرێت.

لەکاتی کڕینی چەك و جلك و کەلو پەلی بووکێنی دەڵێت:

— من لەبەر ئەوە زۆرم ڕك لەدرۆیان دەبێتەوە پێم خۆش نییە درۆم لەپێش بکرێت.

لەکاتی ڕازاندنەوەو بەڕێکردنیشیدا هەمان وتەی دووبارە دەکردەوە. هەرکە دەگاتە ماڵە زاواش هەربەم شێوەیە زاری پچڕی.

ئەوسا پێیدەڵێن:

— درۆی.. چی..؟. ئێستا زاوا دێتە لات!.

ئەویش دەڵێن:

— بەحەقی خوا هەتا دوو گون لەسەر قوونم شۆڕ نەبنەوە باوەڕم نایەت.

**٦-هەتا لە ژیاندا بمێنم:**

ڕۆژێك بەشێخێکیان ڕاگەیاند: ((فلان دەروێشت گوێدرێژی دەعەمەل هێناوە)).

شێخ زۆری لە دڵ گران دەبێتو یەکسەر بەڕوویدا دەقیژێنێتو :

– کوره لای خۆت دەروێش‌و تۆبەکاری ئەوکاره قـۆڕو بـێ ئەخلاقـەت چۆن ئەنجامداوه!؟.

لەگەڵ گرتنی ڕیشه درێژو ماش‌و برنجە جوانەکەیەوه دەڵێت:

– تۆ خوا قوربان من بەو ڕدێنەوه ئەو کارەیان گوتووه!.

شێخ بەقسەکەی دڵنیا دەبێت هەڵبەستراو سارد دەبێتەوه.

دەروێش لەگەڵ هەنگاونانی بۆ دەرەوه ڕیشـەکەی خـۆی مـاچ دەکـات‌و دەڵێت:

– هەتا لە ژیاندا بمێنم سەت کەرت لەپاڵ دەگێم.

**٧-هەتا هەتایی دەیگایت:**

مەلای گوندێك پەیوەندی لەگەڵ بێوەژنێکی تەڕو بـڕو کـۆکی ئـاوایی پەیدا دەکات.

بێوەژنەکە تاقە کوڕێکی دەبێت‌و هەست پێـدەکات: وامـەلا بـەدایکی فێربووەو ناوه ناوه لەگەڵی جووت دەبێـت. نەیـدەزانی چـۆن تۆڵـەی خـۆی لەمەلا بکاتەوه.

شەوێك مەلای دەبینێت وا لەسەربانی مزگەوت بـانگی نوێـژی عیشـا دەدات. کەسیش دیارنەبوو.و لە پێشتڕا پاڵێکی قاییمی پێوه دەنێت و مەلا سەراو سەر بەر دەبێتەوه فەراقی لەبەر دەبڕێت.

دایکی بۆ بەیانی دەڵێت:

– مەلا لەکاتی جێ بەجێ کردنی فەرزی خوا بەربووەتەوه شەهیده.

کوڕەش دەڵێت:

– شەهیدی چی ئەگەر من بەرم نەدابووایەوه هەتا هەتایی دەیگایت.

## ٨-هەر بەژناتی بمێنیتەوە باشترە:

پیاوێك کچی خۆی بەمێرد.دابوو. پاش چەند مانگـان بـۆ.. بـاوەخون دێتەوە. ڕۆژێك ((کەسك‌و سۆرت= پەلکە زێرینـە)) لـە ئاسمانـدا پەیـدا دەبێت. کچە یەکسەر کۆشی خۆی هەڵـدەکات‌و بـەرەو کەسـك‌و سـۆرەکە دەچێت. گوایا واباوە یەکەم کەڕەت پەلکە زێرینە لە ئاسمانـدا پەیـدا بـوو بەکۆش هەڵماڵینەوە بەپیریەوە بچێت: ((ئەگەر پیاو بێـت دەبێتـە ژن، بـە پێچەوانەوە)).

باوکەکە پێیدەڵێت:

— کیژم بۆ.. وادەکەیت؟.

ئەویش دەڵێت:

— هەتا ببمە پیاو.

— ڕۆڵە هەر بەژناتی بمێنیتەوە باشترە.

— بۆ..لەبەرچی؟.

— چونکە تازە تۆ فێرەگاندان بوویت. جا بەژناتی بتگێن باشـترە، نـەك ببیتە پیاو ئەوجا بتگێن.

..................................................

ئەمە وتەی پیاوێکی ناودارەو ناتوانم ناوی بهێنم.

## ٩-هەر چابوو:

لەکاتی دۆلار گرانیدا نووسـینگەیەك تەلـەفۆن بـۆ ماڵێـك دەکـات‌و دەڵێت:

— وەرن دۆلارتان لە دەرەوە بۆ هاتووە.

ئافرەتەکە لە ماڵ دەبێت و.. ویستی بچێت پیاوەکەی بەسەردا دێتەوەو پێی گوت:

— لەفلان نووسینگە تەلەفۆنمان بۆ کراوە دۆلارمان بۆ هاتووە.

پیاوەکەش دەچێت.

خاوەن نووسینگەکە دەڵێت:

— دەبێ بەکێرت ئیمزا بکەیت.

کابرا تووڕە دەبێت و بەهەڵچوونەوە دەڵێت:

— کاکە قەشمەریمان بۆ پێدەکەیت!.

خاوەن نووسینگەکە بۆ ئەوەی بڕوای بێت ئەم سوێندە مزرەی پێدا دەدات:

— حەڵاڵی دنیایی لەمن حەرام بێت هەتا بەکێر ئیمزای نەکەیت ناتدەمێ.

کابرا ناچار لەپەنایەکەوە بەسەری کێری ئیمزا داکات.

هەرکە دەچێتەوە دەڵێتە ژنەکەی:

— هەرچابوو ئەتوو نەچوویت.

### ١٠-هەرسێزدە بەردیلت:

لە گوندێك لە گوندەکانی قەراج ((شێخ عەلی)) ناوێك دەبێت بەمەلای ئاوایی دەڵێت:

— گوناحێك هەیە دەمەوێ بیکەم، دەبێ تۆش فتوام بۆ بدەیت.

مەلاش بەهیچ شێوەیەك ناسەلمێنێت.

شێخ عەلی لێی توورە دەبێتو دەیەوێت ئەو یارمەتییەی مەلای داوە بیخاتە بەرچاو، بەڵکی دڵی نەرم دەبێتو دەڵێت:

–مەلا من سێزدە بەردیلە زەکاتم بەجەنابت داوە.

مەلاش بێ سێو دوو دەڵێت:

– هەرسێزدە بەردیلت بگێم.

..........................................................

بەردیل ـ ئەو سپیانە مێیەیە کەبۆ یەکەجار بەران دەخوات. دوای زانیش پێیدەڵێن ((بەردیلە زا)). هەرکە بەرخەکەی لێ دابڕا ئەوسا بە((بەربوارد)) ناودەبردرێتو لەبەردیل دەترازێت.

## ١١–هەرکەس لەمزگەوت بکێشێ قەننوون:

موستەعیدێکی زۆر زیرەکو بەهرەدارو بێ مویالات لە ژیاندا نەماوە:((ناوهێنانی ڕەوانییە)) لەخزمەت جەنابی مەلای کۆیی دەخوێنێت.

ڕۆژێك موستەعیدەکە لەناو مزگەفت لەسەر گازەرەی پشت درێژ دەبێتو لینگ بەدیوار هەڵدەواسێتو هێندی هێندی قەننە دەکێشێت. لەوساتەدا جەنابی مامۆستای تایەن بەژوور دەکەوێت.

موستەعیدەکە لەجیاتی لەبەری قیت بێتەوەو خۆی لەگوورە نابات و دەڵێت:

–مامۆستا قەننەکێشان لەمزگەفت درووستە؟.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

— هەرکەس لە مزگەوت بکێشی قەننون.

قەننوونەکەی دەبڕن لەقوون.

— جەزائەن بما کونتم تەعمەلوون.

۱۲-هەموو چوولەکەر:

کوردێك‌و عەرەبێك لەکاتی گەنجاتی دۆست‌و خۆشەویستی یەکتر دەبن. چەند ساڵ‌و حەیام لەیەکتر دادەبڕێن.

هەرکە دەگەنەوە یەك عەرەبەکە دەبێتە میوانی کوردەکەو سەیردەکات ماڵەکەی لەبەر کوڕو کوڕەزای زۆر قەرغەو قەرەباڵغـە. هەرکـە کوردەکـە دەچێتە ماڵە عەرەبەکە دەبینێت منداڵەکانی سەرکەوبنکەنەو پێیدەڵێت:

— ئەوە بۆ.. کۆزت ساوایە؟.

ئەویش دەڵێت:

— هی پێشتر هەموو چوو لەکەر.

۱۳-هەموو خەتای من بوو:

پیاوێك ژنەکەی منداڵی دەبوو.. و گەیاندوویە نەخۆشخانە.

ئافرەتەکە لەتاو ژانی منداڵبوونییەوە زیڕەی دەگەیشتە کەشـکەلانی ئاسمانەوە.

مێردەکەش هەرجارێك، کە گوێی لەهاواری دەبوو.. بەگریانەوە لەبەری ڕانی خۆی دەداو دەیگوت:

— هەموو خەتای من بوو، هەموو خەتای من بوو ئەوەهای بەسەر هات.

### ١٤-هەمووی بەقوربانی:

دوو کچ مێردیان کردو لەکاتی باوە خونیدا هەریەکەیان بەجلو چەك و خشلی خۆی هەڵدەداو یەکیان گوتی:

—من گوارەم خەزێمو لاسەرەو بازنو کەمەریەندم بۆ کراوەو جلکی بەریش لەباس نایەت.

ئەویتر بەلچ قرتاندنی دڕدۆنگییەوە.. ویستی بەناو هێنانی بابەتەکانی خۆی لافی لەسەر لێ بدات، کەچی قەیرە ژنێکی تەکیانەوە نەیهێشت زار هەڵبێنێت و گوتی:

—ئەوانەی دەڵێن هەموویان بەقوربانی گانێکی بەرەبەیان بێت.

### ١٥-هەولێر:

زۆر لەمێژە هەولێر بەشاری ((قەلاومنارە)) ناودارە. کەچی ئەمڕۆ لەبەر کۆنی ئەم دووانە باوی جارانیان نەماوەو دووشتی تر بەهۆی ڕۆژانە زۆر دووبارە دەبنەوەو ژمارەشیان فرە زۆرەبەسەر هەردووکیان زاڵن ئەوانیش ((مەلاو قنارەیە)).

یەکەمیان: ((٥٠٠)) پێنج سەت مزگەوتی هەیەو لەشەبەقی بەیانییانییەوەڕا هەتا نوێژی خەوتنان پێنج کەرەت مەلا بانگ دەدات. هەر بانگیش سێ ((٣)) سەلاواتی لەپاڵە. کەواتە مەلا دەنگی دەهەزارجار لەماوەی باسکراو لەئاسمانی شاردا دەزرینگێتەوە. بۆیە وشەی ((قەلا))ی ڕەش کردووەتەوەو (مەلا) لە شوێنەکەی سەنگرایەوە.

ڕۆژانەش چەندین ئاژەڵ دەکوژرێتەوەو گۆشتەکەیان لەورگی خەڵکەکە ساخ دەبێتەوە. ئەمەش ناوی ((منارە))ی داپۆشتووە. کەواتە ساخ بووەوە((هەولێر شاری ((مەلاو قنارە))یە، نەك ((شاری قەڵاو منارە)).

ئەمەشم لە مامۆستای ڕێزدار ((عومەر فەرهادی)) وەرگرتووە. سوپاس.

بۆ شاری ((سلێمانیو دهۆك))ی ئازیزیشی داناوە. بەڵام لەبەر ئەوە من لە دووشارە لەدایك نەبوومە ناتوانم بیانخەمە سەر کاغەز.

تێبینی:

چەند بابەتێکم لە شێوەی چیرۆك داڕشتوونە تاکو خوێنەر زەوقی بچێتەسەر خوێندنەوە.